حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٣٠٦)

# بۆ زمان

د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ

سلێمانی ٢٠٠٥

# بۆ زمان

نووسینی: د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ

بابەت: زمانەوانی

نەخشەسازی کۆمپیوتەر: دیاری جەمال

سەرپەرشتیاری چاپ: سەلام فاتیح

بەرگ : دیاری جەمال

چاپ: چاپخانەی شڤان

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردنی (٧٧)ی ساڵی ٢٠٠٥ی وەزارەتی رۆشنبیریی پێدراوە

www.roshnbiri . org

# پێشەکی

ڕەنگە هەموو کتێبێك لای نووسەرەکەی چیرۆکێکی هەبێ. کەی و چۆن و بۆچی نووسی؟ ئینجا چۆنی چاپ کرد، چەندی ئازار بەدەست چاپخانە و هەڵە ڕاست کردنەوە و بڵاوکردنەوەو زۆر لەو خاوەن کتێبخانانەوە چەشتووە کە بۆیان فرۆشتووە.

ڕەحمەتی مامۆستا گیوی موکریانی دڵسۆزی کورد و ووشەی کوردی بوو، بەو چاپخانە پچووکانەی خۆیان کە ڕۆژێك لە حەڵەب و ڕۆژێك لە ڕەواندز و دووا جار لە هەولێر لەگەڵ خۆیان ئاوارە بوو کتێب دووای کتێبی چاپدەکرد کە دەستی ڕەنگینی حوزنیی گەورە — داماوی برای و خۆی هۆی سەرکەوتنی هونەری چاپەکەبوو. مامۆستا گیو هەر کتێبێکی چاپ دەکرد، بەشی بەغدای دەهێنایە لای مامۆستا بەشیر موشیر، بۆ ئەوەی بیفرۆشێ و پارەشی نەداتێ، کەس نەیدەوێرا داوای پارەی کتێب لە مامۆستا بەشیر بکات. مەمنوون بویتایە ئەگەر ئەو ٢٠٪ کرێی فرۆشتنی لێنەسەندیتایە. مامۆستا گیو هەمیشە ژمارەی لەسەر بەرگی چاپکراوی نوێی دەنووسی، لە سووچی لای چەپەوە دەینووسی ژمارەی پەخشیات (      )، واتە (ئەوەندە) ڕۆژێك بە چرپە باسی مامۆستا بەشیر دەکرا کە ناوێرێ داوای پارەی لێ بکات، چونکە هەر کەس داوای پارەی لێبکردایە کتێبەکانی بۆ فڕێدەدایە سەر جادەکەو دەیووت: دەبڕۆ ئەوە خۆت و ئەوە کتێبت : ئەمین (واتە: من) ئیتر کوردایەتی ناکەم، واتە کتێب نافرۆشم. باسی ئەمە دەکرا (بە چرپە)، ڕەحمەتی ڕەفیق چالاك کەمێك دەنگی هەڵبڕی و ووتی: (مامۆستا-هەر ئەوەندەت بەرئەکەوێ من بەدەنگی بەرز دوعات بۆ دەکەم: یاڕەبی ژمارەی پەخشیاتت بگات بە هەزار).

ئەم سەرەتا چیرۆك ئامێزە ڕەنگە بۆ کتێبێکی سەر بە زانستی دەستنەدات، کە خۆم ڕەخنەم لەو جۆرە کارە گرتووە. بەڵام بە ڕێگەی مامۆستای گەورە عەلائەدین سەجادیدا کە دەیفەرموو: هەر دەرفەتی چاپت بۆ هەڵکەوت چیت لا کۆبۆوە چاپی بکە،

نەك دەرفەتیترت بۆ هەڵنەكەوێ، پاشان تێبینییەك كە ئازاریدام ئەمەی پێنووسیم، ئەویش ئەوە بوو لە دانیشتنێكدا كەسێكی نزیكی خۆم كە لە ڕیزی خوێندەوار و ڕۆشنبیردا دەژمێررێ و گەڵێك سیفەتیتری لەم بارەیەوە هەیە، بەراوردی منی لەگەڵ كەسێكیتردا دەكرد كە گوایە وەك یەك( پڕو قووڵین) بەلاّم ئەو بەرهەم و نووسینی هەیە، من هیچ نووسینم نییە.

ئازاردانەكە لەو ڕووەوە بوو كە ئەو كەسە شانازی بە منەوە دەكات، منیش لای خۆم سەرمایەی گەورەم كتێبەكانمە، هەر بەهۆی بیركردنەوەوە ژمارەی ٥١ كتێبم بۆ تۆماركرد كە شانازی بەوانەوە بكات، ڕەنگە ئیتر هەوڵ بدەم ناوی چاپكراوەكانیشم لە كۆتایی كتێبدا بنووسم، هەرچەندە تەگەرەی چاپ و بێتوانایی هەمیشە وایكردووە كە لاپەڕەی زیاد بەو ناوانەوە پڕنەكەمەوە.

وەك ووتم: هەموو كتێبێك لای من چیرۆكێكی هەیە. لەسەفەرێكدا لەسەر سنوور یاساوڵێكی تورك دەستی دایە هەندێ لاپەڕەی بەقەڵەم لێنووسراو و پرسیی: ئەمە چییە؟

وەلاّمم دایەوە: نووسین

پرسیی: هیكێیە؟

ووتم:هی خۆمە

پرسیی: چیت نووسیوە؟

ووتم: ئەدەبیاتە

پرسیی: بۆ نووسیوتە؟

ووتم: چونكە نووسەرم، هەر بەتوركی دووبارەم كردەوە: یازچییەم، یازچییەم-ئیتر خوا هەقە بێدەنگ بوو.

لەكۆندا هەندێك شتم لە بارەی زمانەوە نووسیبوو، لەسالأنی حەفتادا كە مەودای ڕۆژنامە نووسی خەریكی فراوانبوون بوو، كوردی نووسینیش بەرەو ئەم ( سەقەتی)یەی ئێستا دەچوو، بیرم لە ڕێگەكەی مامۆستام دوكتۆر مستەفا جەواد كردەوە، كە ( قل...ولا تقل) واتە (بڵێ و مەڵێ)ی بۆ بەعەرەب دەنووسی. هەرچەندە من هێندەی ئەو دوژمنی (هەڵەی باو) نیم، بەلاّم هەندێك هەڵە هەیە نابێ لێیان

بێدەنگ بین، لەگەڵ ئەوەشدا چەند بە نووسین و چەند بە سیمینار و قسەکردن لە بارەی چەوتکردنی زمانەوە دوواوم، بەلاّم ڕەنگە ئەنجامەکەی هەر ئەوە بێ کە لەگەڵ شاعیری عەرەبدا بڵێم:

لقد أسمعت لو ناديت حيا          ولكن لا حياة لمن تنادي

(واتە: ئەوەی تۆ ڕووی دەمی تێدەکەیت و بانگی دەکەیت زیندوو بووایە گوێی لێدەگرتیت، بەلاّم ئەوەی بانگی دەکەیت لە ژیاندا نییە).

ناهەقم نییە وا بڵێم: بۆ ئەمەش چەند چیرۆکێکم هەیە.

- ساڵی ١٩٧٠ کە دەستم دایە ئەو نووسینانە، کەس نەبوو بڵێ ئەوەی نووسیوتە ڕاست نییە. بەلاّم زانایەکی ناسراوی کورد(کە زۆر دۆستمە) لە جیاتی دەستخۆشی. وتی: دەڵێن چی لەو هەلاّنەلە کتێبەکانی خۆتدا هەن بۆیان نیشانە کردوویت و لە یەکێتی نووسەران بۆیان فڕێداویت. ووتم: کاکی خۆم ئەوە بەیاننامەی نهێنی نییە، زۆرم پێ خۆشە، بە ئاشکرا پیشانم بدەن، ئەوەی لام ڕاست بێت لەمەودووا چاکی دەکەم و ئەوەی وەلاّمیشم هەبێ ئەوەشتێکیترە.

- ساڵی ١٩٧٨ لە لەندەن بە خزمەت زانای گەورەی کورد تۆفیق وەهبی گەیشتم زۆر دەستخۆشیی لێکردم و ئامۆژگاریی کردم کە خەریکی زمان بم. بە ڕاستی بڕیارم دا هەر بەو (بڵێ و مەڵێ)یەوە خەریکبم، بەمەرجێك لەگەڵ یەکێك لە شارەزاکانی زماندا پێکەوە کاربکەین. من کەرەسەکە (کە زۆرم لا کۆبۆتەوە) بە سەلیقە بخەمە بەردەمی و پێکەوە لە ڕووی زانستییەوە نەگونجانەکە دەربخەین، بەلاّم تا ئێستا ئەو کەسە پەیدانەبوو کە ئامادەی ئەو کارەبێت، منیش هەر کەرەسە کۆدەکەمەوە.

- ڕۆژێك لەگەڵ هاوڕێم چیرۆکنووسی ناودار حسین عارفدا لە باسی ئەم کوردییەی ڕۆژنامەکانی ئێستا و هەندێ نووسەری ئێستا دەدواین، ووتی: نووسین سوودی نییە، با تێبینی کۆبکەینەوە و بچینە لای نووسەرانی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکان.

من دەرفەتم بۆ هەڵکەوت، ئەو باسەم بۆ کاك عادل مراد کرد، یەکسەر ووتی: هەستە با بچین بۆ تەلەفزیۆن لە لووتکەی ئەزمڕ. لە شێوەی سیمیناردا زمانی ((دەنگوباس))م باسکرد کە هەندێك شت خۆی فەرمانە و دوو فرمانی ناوێ:

بۆ نموونە: فلاّن دەستە کۆبوونەوە- ئیتر کۆبوونەوەی کرد، یا کۆبوونەوەی سازکرد یا ئەنجام دا زیادە و ئاڵۆزکردنە. یا دەڵێیت: فلاّن وەزیر سەریدا لە فلاّن قوتابخانەدا، چونکە کورد دەڵێ سەرم لە ماڵی باوکم دا، یا سەرێکم لە بازاڕدا.

لە کۆتاییدا لاوێکم لێ ڕاپەڕی و ووتی: تۆ نازانیت زمان پێش دەکەوێت، تۆ نازانیت زمان دەگۆڕێت، ئیتر گرتمیە بەر (تۆ نازانیت)، بێگومان تەمەنی ئەو لاوە هەڵچووە نەگەیشتبووە هەژدە ساڵ. دەبێ لەوێدا وەلاّمی منیش دەبێ لێرەدا ئەوە بێ کە کورد ئەوەش دەڵێن کە : سەرم دا لەبەرد.

جارێکیتر لێپرسراوی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ك) کاك محەمەد تۆفیق داوای سمینارێکی لێکردم لەو بارەیەوە، کە زوربەی کارکەر و نووسەرانی ڕاگەیاندن لەوێبوون. زۆرتر لەودرگێڕانی حەرفی دووام لە عەرەبیەوە، کە بەرامبەریان بە کوردی هەیە و جوانتر و ڕەوانترە. نموونەکانم لە ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژەوە وەرگرت، بەلاّم کە بۆ سبەینێ سەیری ڕۆژنامەم کرد دیم کە ئەوانەی من بەهەڵەم داناون، دوو ئەوەندەی جاران بلاّوکراونەتەوە.

کەواتە- چوونە خزمەتیشیان سوودی نیە، بەلاّم هەر لەبەر مێژوو بێدەنگ بوونیش باش نیە. خەریکم ئەو کەرەسەیە ئەکەم بە نامیلکەیەکی تایبەتی، لەترسی ئەوەش کە نەخۆشی و ژیان و چاپ نەڕەخساندن ئەو دەرفەتەم بۆ دروست نەکەن، لێرەدا نووسراوە کۆنەکان کە لەبەردەستدا نین چاپ دەکەم.

دووەم: کەرەسەی ئەم کتێبە چاپکردنەوەی ئەو نامیلکەیەیە کە لە ساڵی ١٩٧١ دا لەبارەی ((زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو))ەوە نوسیبووم و پاش ئەوەش لە چەند سیمیناردا لە ناوەوە و لە دەرەوە چوو بوومەوە سەر ئەو باسە. لەبەردەستدا نەبوونی نامیلکەکە و ووتارەکان پێویستیی چاپکردنەوەیان خستەوە سەرشانم.

بەلاّم بەشی گرنگی ئەم کتێبە ئەو فەسڵەیە لە کتێبی زمانەوانی کە لە ڕووسیەوە بۆ خوێندکارانی ماجستێر و دوکتۆرای کوردیی زانکۆی سلێمانیم وەرگێڕا بوو. ئەوسا —دوور لە ئێستا- لەو زانکۆیەدا خوێندکاری ماجستێر و دوکتۆرای کوردی و عەرەبی وەردەگێران.

ئەو فەسڵە و نەخشەی زمانەکانی جیهان بایەخێکی گەورەی هەیە. بە تایبەتی کە خەستەی ڕای زانایانی سۆڤێتەو ڕەنگە جیاوازیی لەگەڵ دابەشکردنی زانایانی وولاّتانیتردا هەبێت.

ئەنجام- ئەمەش کتێبێکیتر، کە ڕەنگە ژمارە (٥٢)ی بدەمێ و هیوام وایە سوودی هەبێت.

سلێمانی

٢٠٠٣/٧/٢٠

# زمـــان

نـەریتی ئیشارەتی هـەموو سروشـتێکی فیزیاییـیـە، ئـەرکی زانـین و بـەردەوامی لـە کـرداری گورجوگـۆڵیی مرۆڤانــەدا بەجێـدەهێنێ. لەوانەیـە زمـان سروشـتی بێـت یـا دەسـتکرد بێـت پێکـەوە. زمـانی سروشـتی زمـانی ژیـانی ڕۆژانەیـە و وەك ڕوخسارێکی دەربڕینی بیروهۆیەکی بەیەکەوە لکاندنی خەڵك سوودی دەبێت. زمـانی دەسـتکرد ئـەو زمانەیـە کـە خـەڵك بـۆ بـەجێ هینـانی پێویسـتیی تایبـەتی دروسـتیانکردووە ( زمـانی نیشـانەکانی وەرزش، زمـانی تیۆرییـیــە فیزیاییـیــەکان و ڕێ و شـوێنی جیـاوازی ڕینـوێنی....هتـد). زمـان دیاردەیــەکی کۆمەڵایەتیـیــە بــەدەم بــەرەو پێشچـوونی بەرهـەمهێنانی کۆمەڵایەتیـیـەوە پەیـدا دەبێـت. زمـان لـە ڕووی فیسیۆلۆژیەوە وەك نەریتی دووەمی ئیشارەت کاردەکات، ئەوەیە پاڤلۆڤ ناوی ناوە زیادکردنی لـە چۆنیەتیی دەروونی مرۆڤدا. زمـان شێوەیەکە لـە شێوەکانی بیر و دەربڕینـی- هـەر لـەو کاتەشـدا ڕۆڵێکی گرنگـی هەیـە لـە دروسـتبوونی هوشـیاریدا، چـونکە لـە دەرەوەی زمانـدا نـە هوشیاری هەیـە و نـەدەتوانێ ببێـت. نیشـانەی زمـان وەك ئیسـتلاحێك بـۆ ئـەو شـتەی مانـای ئـەو دەگـەیێنێ، بـەهۆی سروشـتی مـادیی خۆیـەوە هـەر لەگـەڵ ئـەودا هـۆی کۆمەڵایەتیی هەیـە. نـاوەڕۆکی ئـەو هوشیارییەی لـە زمانـدا هەیـە نـاوەڕۆکی سـەر بـە زمانە (ماناداری فەرهەنگ و ڕێزمانی نیشانەی زمان).

زمـان هۆیەکـە بـۆ چەسـپاندن و پاراسـتنی زانینـی گردەوەبـوو و گەیانـدنی لـە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیـەك. بـە تـەنیا زمـان سـەر بـە بـوونی تـەنیای بـیرە. بـوونی زمـان مەرجێکی پێویستی چالاکیی تەشـەنە سـەندووی بـیرە (سـەیری باسـی تەشـەنە سـەندن بکە).

لێنین دەڵێ: هەموو ووشەیەك (قسەیە) تەشـەنە سـەندنە، لەگـەڵ ئەوەشـدا زمـان و بـیر یـەك شـت نـین. زمـان پـاش ئـەوەی دروسـت دەبـێ بـە جـۆرێکی نیسـبی سـەربەخۆ دەبێت، دووای چەند قانوونی چۆنیەتی دەبێ کە لـە قانوونـەکانی بـیر جیـاوازن. لەبـەر

ئەوە ناسنامەیەك لە نێوان کەتیگۆری (مەفهووم —و) و ووشەدا، لە نێوان بڕیار و دەربڕیندا نییە.

لەوە زیاتر زمان نەریتێکە "چنین " ی ناوخۆی خۆیی بۆ دەست نیشانکراوە لە توانای سروشتی نیشانەیەکی سەر بە زمان و مانای ئەودا نییە کە لە دەرەوەی خۆیدا تێی بگەین. کە ڕۆڵی لێکۆڵینەوەی تیۆری لە دەیان ساڵی دووایییدا زیاتر بووە. بایەخدانی تەواو بە لێکۆڵینەوەی قانوونەکانی زمانە فۆرماڵییە دەستکردەکان و پێکهاتنی لۆژیکی و مانا گەیاندنی ووشەی لۆژیکی زیاد دەبێ و ئەم بارە هاوچەرخە تازەیە گرنگییەکی تەواو دەدات بە ڕۆڵی ئەو لێکۆڵینەوانە و مانایان. بەهەڵە هەوڵئەدەن ئەو تەنگ و چەڵەمانەی لە لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکاندا هەن بەرەو لێکدانەوەی لۆژیکیی زمانیان بەرن.

(لە ئەنسکلۆپیدیای سۆڤێتییەوە)

# ئا. ئا. ریفۆرماتسکیی

# سەرەتایەك لە زانستی زمان

چاپی چوارەم راستکراوەو تەواو کراوە

لەلایەن بەڕێوەبەریی سەرەکیی دەستگای باڵاو ناوەڕاستی ئینستووتەکانی خوێندنی پەروەردەیی وەزارەتی رۆشنبیریی رووسیایی فیدرالیی سۆسیالیستییەوە بەکتێبی خوێندنی کۆلێجە فیلۆلۆژییەکانی ئینستیتووتەکانی فیلۆلۆژی دانی پێدانراوە..

دەستگای بلاوکردنەوەی رووناکبیری مۆسکۆ – ١٩٦٧

## زمانەکانی جیهان

لەسەر زەمین بەژماردن نزیکەی دوو هەزارو پێنجسەد زمان هەیە[1]، زەحمەتیی نیشانکردنی ژمارەی زمانەکان پێش هەموو شت بەستراوە بەوەوە کەلەزۆر حاڵدا لەبەر ناتەواویی لێکۆڵینەوەوە ئەوە دیار نییە کەئەمە زمانێکی سەربەخۆیە یا دیالێکتی زمانێکە. لەبەر ئەمە مەسەلەی ژمارەی ئەوانەی بەم (زمان)ە دەدوێن ناتوانێ رۆڵی خۆی هەبێ، هەروەك دیالێکتی وا هەیە هەڵگرانی بەسەدان هەزار یازیاتر دەبن، زمانی ئەوتۆش هەیە، قسە پێکەرانی رەنگە هەر هەموو چەند هەزار یا کەمتر بن. زمانی وا هەیە، لەناو جوغزێکی تەسکی قسەپێکەراندا بەکاردێت (زمانی تیرەکانی ئەفەریقا، پۆلینیزی، هیندییەکانی ئەمەریکا، زمانە یەك گوندییەکانی داگستان) زمانەکانیتر نوێنەری گەل و نەتەوەن، بەڵام هەر بەو گەلەوە بەستراون (بۆنموونە، زمانەکانی

[1] لەهەندێك سەرچاوەدا ژمارەکە لەمە زیاترە. (وەرگێڕ)

داگستان لەقرگیزستان و کازاخستان، زمانی مانسێیی یا ڤۆگلوویی لەباکووری پشت ئوورال) یا بەنەتەوەوە بەستراون (بۆنموونە، زمانەکانی چیکی، پۆلۆنی، بۆلگاری)
سێیەم: چەند نەتەوەیەك بەکاریان دەهێنن( بۆنموونە، زمانی پورتوگالی لەپورتوگال و بەرازیل، زمانی فەرەنسی لەفەرەنسا، بەلچیکاو سویسرە، زمانی ئینگلیزی — لەئینگلیزستان و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەڵەمانی، لەئەڵەمانیاو نەمسا، ئیسپانی لەئیسپانیاو ٢٠ کۆماری باشووری ناوەڕاستی ئەمەریکا)

زمانی نێونەتەوەیی هەن، کەبلاوکراوەو کەرەسە یەکگرتووەکانی نێونەتەوەییان پێ چاپ دەکرێت؛ ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان، کۆمیتەی پاراستنی ئاشتی و ئەوانیتر (رووسی، ئینگلیزی، فەرەنسی، ئیسپانی، چینی، عەرەبی)؛ هەرچەندە یەك نەتەوە زمانی رووسی بەکاردێنێت، بەلام زمانی نێونەتەوەیی گەلانی یەکێتیی سۆڤیەتەو یەکێکە لەو زمانە نێونەتەوەییە کەمانەی لەجیهاندا هەن.

ئەو چەشنە زمانەش هەن، کەبەبەراورد لەگەڵ زمانە هاوچەرخەکاندا دەبێ بەمردوو بژمێردرێن، بەلام ئەوانە لەزرووفی دیاریکراودا بەهاو چەرخیش دادەنرێن؛ ئەمە پێش هەموو زمانێك لاتینییە- زمانی کڵێسەی کاسۆلیکی، زانست، ناوی ئیستیلاح و تێرمین (ئیستیلاح — و- ) ی نێونەتەوەیی، بەم رادە یا ئەو رادە گریکیی کۆن و عەرەبیی کلاسیکیی پێوەندییان هەیە (٢) زانین لەبارەی زمان و مێژوویانەوە لەرادەبەدەر رێکۆپێك نییە.؟ زمانی ئەوتۆش هەیە مێژووەکەی لەسایەی مانەوەی یادگاری نووسراوو تەنانەت وەسفی تیۆرییەوە لەماوەی بیست یا سی سەدەدا دیارە، وەك زمانی گریکی لەهۆمیرۆسەوە تا ئەمڕۆ یا زمانەکانی دانیشتووە هیندۆ ئەورووپییەکانی هیندستان لەزەمانی سروودەکانی ڤیداوە تا زمانە هیندۆ ئەورووپییە تازەکان.

---

٢ بۆ زمانی کلاسیکیی عەرەب ئەگەر مەبەست عەرەبیی فەسیح بێت کە (عامی)ی هەر وولاتە جیاوازە، ئەمە ئەم تێگەیشتنەی یا نموونەیە هەر بۆ بەکارهێنانی ئەو زمانە لەلایەن گەلە موسڵمانە ناعەرەبەکانەوە راستە، ئەگەر مەبەستیش عەرەبییە کۆنەکەی باشووری یەمەن و دورگەی عەرەب بێت، ئەوە شتێکیترە. (وەرگێر)

زمانی ئەوتۆش هەن، تەنانەت لەناو زمانە هیندۆ ئەوروپییەکاندا، کەنووسراوی زۆر کۆنیان هەیە، بەلاّم زانست هەر لەسەدەی بیستەمدا بەلگەی لەبارەیانەوە دەستکەوتووە. ئەمە وەك زمانە توخارییەکان کەتاسەدەی حەوتەمی ز لەسەر خاکی رۆژئاوای چیندا قسەیان پێدەکرا (واتە: رۆژهەلاّتی تورکستان) یا هیتی زمانی (هیتی – نیستی)و چەند زمانی مردوویتری ئاسیای بچووك، کەلەزۆر سەدەی پێش میلادەوە نووسینیان هەیە، بەلاّم تەنیا لەئەنجامی بەزەحمەت هەلّهێنانی نووسینی یادگارە میخیو هیرۆگلیفییەکانی ئەم کلتوورەوە لەلایەن ئەرکۆلۆگەکانی سەدەی بیستەمەوە بۆتە مولّکی زانست

زمان هەن مێژوویان لەسەدەکانی ٤،٥،٨،١٠ وە زانراوە وەك زمانانی ئەلّەمانی، ئەرمەنی، گورجی، زمانە تورکییەکان، سلاڤییەکان.

زمانی واش هەن، مێژوویان لەمەودای چوار – پێنج سەدەوە لەسایەی نووسینەکانی دواییدا باوەریان پێدەکرێ (لاتیشی، ئەلبانی)

زۆربەی زمانەکانی ئەفەریقا، ئوسترالیا، ئەمەریکا تەنیا لەزەمانی تۆمارکردنیانەوە لەلایەن میسیۆنێرەکانەوە (سەدەکانی ١٩-٢٠)دەناسرێن.

ترادیسیۆنی درێژی نووسین هەمیشە نابێتە سەرچاوەی باوەرپێکراو بۆ زانینی مێژووی زمان، وەك مێژووی نووسینی چینی لەسایەی سروشتی هیرۆگلیفییەوە. تەتبیقکردنی نووسینێکی نامۆ بەسەر زمانی ئەم بینا یا جۆردا گەلێك شتی نادیار دەدات، نموونەی ئەمە نووسینی عەرەبییە لای گەلانی نزیك و ناوەراستی ئاسیا، هیندستان، قەفقاس و مەلایۆ.

زۆربەی زمانەکانی جیهان تاسەدەی بیستەم بێ نووسین مابوونەوە (زمانی گەلانی ژێردەست کۆلۆنیالیزم یا زۆربەی زمانە ‌‌:رەگەزجیاکانی ئیمپراتۆریەتی رووسی([٢])، بەلاّم ئێستاش ژمارەیەکی زۆر لەزمانەکانی ئەفەریقا، ئوسترالیا، خەلّکی پۆلینینزیو تۆزیمینی لەئەمەریکا نووسینیان نییە.

[٢] نووسەر دان بەداگیرکردنی ئەم گەلانەدا ناهێنێ لەلایەن رووسەوە. (وەرگێر)

لەسایەی سەرکەوتوویی یادگارە نووسراوەکاندا یا لەسایەی تارادەیەك تازەییاندا (وەك بۆ نموونە، یادگارەکانی زمانی ئەلبانیو لاتشی) زانست دەتوانێت بەهۆی لێکۆڵینەوەی بەراوردی مێژوویانەوە رۆبچێتە قووڵایی مێژووی زمانەوە (بڕوانە ٧٧)

## ٧٥- توانای پۆلینکردنی زمان

زمانەوانی دوو رێگەی هەیە بۆ پۆلینکردنی زمان: بەگروپکردنی وزمان بەپێی رای گشتیی کەرەسەی زمان (رەگ، پاشگر- ئافیکس، وشە، لەوەزیاتر بەپێی رای گشتیی نەژادی- ئەمەیان بۆ پۆلینکردنی گینۆلۆگیی زمان ([4]). هەروەها بەگروپکردنی زمان بەپێی بیناو جۆری گشتی، پێش هەموو شت گراماتیکی، بەجیا لەرەسەنی زمانەکە ئەمە تیپۆلۆگییە، یا بڵێین، بەپێی مۆرفۆلۆگی پۆلینکردنی زمانە.

پۆلینکردنی گینۆلۆگیی زمان یەکسەر بەستراوە بەسەرەنجامی مێژوویی زمانو گەلانەوە، بەهەڵگرانی ئەم زمانانەوە، پێش هەموو شت بەراوردی لێکسیکاو فۆنەتیك، پاشان گراماتیك، پۆلینکردنی مۆرفۆلۆگیش بەستراوە بەتێگەیشتنی بینا- سیستێمی زمانەوە بەشێوەی گشتیش پشت بەگراماتیکەوە دەبەستێ.

تەجروبە بەراییەکانی پۆلینکردنی زمان بەستراوە بەزەوییی "خزمایەتی" ی زمانەکانو پەیدابوونی خێزانە خزم، مەسەلەی پۆلینکردنی مۆرفۆلۆگی درەنگتر پەیدابوو، شێوەی ئێمە لەپۆلینکردنی مۆرفۆلۆگیی زمانەوە دەست پێدەکات.

## ٧٦- تەجروبە بەراییەکانی پۆلێنکردنی گینیگۆلۆگیی زمان

بیری کۆن (یۆنانو رۆمانی کۆن — و-) زۆر بایەخی نەداوە بەمەسەلەی وێنە زۆریی زمان، بەجۆرێك کەگریكو رۆمان تەنیا دانیان بەهێژایی لێکۆڵینەوەکانی زمانی خۆیاندا ناوە. زمانەکانیتریان بە(بەربەری)[5] (کێویی درندە- و- داناوە)، قسەی بێگانەیان لەریزی "ورتەورت"ێکی نادیاردا داناوە.

---

[4] گینولۆگی-لەگینیالۆگی-ی گریکییەوە، بەمانا رەگەز-نەژاد.

[5] لەولایەوە کە لاسایی دەنگ لەنێوان ووشەی "باربرۆس"ی گریکی- "بۆلۆبۆلا"دا هەیە. (تێبینی وەرگێر: ئەم ووشە گریکییە تەواو لەگەڵ (بۆڵەبۆڵ)ی کوردیدا یەکن.

لەسەدەکانی ناوەڕاستدا مەسەلەی وێنە زۆریی زمان بوو بەشتێکی بەلگەنەویست هەروەك "بەربەر" ڕۆمایان رووخاندو گەلێك زمانی "بەربەری" هاتنە مەیدانی کلتوورەوە (کێلتی، جێرمانی، سلاڤی، تورکی.. هتد) کەهیچ یەکێك لەمانە بە"تاك" ناژمێررێت، بەلام کارکردنە سەر یەکی گەلانی زمان جیاواز لەو چەرخەدا یا بەهۆی کاری جەنگ یا بەهۆی گوزەرانی ژیانەوە بەیەکداچووە، کەدیارە لەپلەیەکی دیاردا زانینی زمانی بێگانەی دەوێت، بەلام ئەمە نەگەیشتە سەر نەخشە کێشانی لێکۆڵینەوەی زمانە بێگانەکان.

مەسەلە تیۆریەکانیش بەپێی ئەوەی، خوێندەواری بەدەست کلێسەوە بوو، تەنیا بەیەکگرتوویی لەگەڵ تەوراتدا بڕیاری لەسەر دراوە، کەلەوێدا بوونی زمانی زۆربە بەپێی ئەفسانەی بورجی بابلەوە لێکدراوەتەوە، کەلەوێدا وتراوە خوداوەند زمانی ئەو گەلانەی تێکەڵ کردووە، کەئەم بورجەیان دروستکردووە، تا نەیەڵێت خەلکی بگەنە ئاسمان. باوەڕ بەم ئەفسانەیە تاسەدەی نۆزدەهەم ژیا.. بەلام زۆرتری مێشکە هوشیاربووەکان هەولی ئەوەیانداوە کەپشت بەدەستکەوتی واقیعی لەزۆریی زمان بگەن.

لەرزینی باری ئەم مەسەلەیە لەنەخشەی زانستدا ئەرکی پراکتیکی سەردەمی راپەڕین بوو، کەپێویست بوو لەڕووی تیۆرییەوە لەمەسەلەی بارو جۆری زمانی نەتەوەیی بگەن، ئەو زمانانەی دەربڕی کلتووری نویو هاوپێوەندیی بوون لەگەڵ زمانی ئەدەبیی فیودالیی چەرخەکانی ناوەڕاستدا، پاش ئەوە هەر خۆیان سەر لەنوێ نرخیان دا بەپاشماوەی گریکی — ڕۆمانیو پاشماوە کۆنەکانیتر.

گەڕان بەدوای کەرەسەی خاوو بازاری کۆلۆنیالی پالیان بەنوێنەرانی دەوڵەتە بۆرژوازییە لاوەکانەوە نا کەدەست بدەنە گەڕان بەدەوری جیهاندا. چەرخی "گەشتو دۆزینەوەی مەزن"، ئەوروپاییەکانی بەتوزمینییەکانی ئاسیا، ئەفەریقا، ئەمەریکا، ئوستڕالیاو ئۆقیانوسەکان ناساند.

سیاسەتی تالانکردنی پێشبڕکێکەرە بەرایییەکان لەبارەی توزمینییەکانەوە نەخشەی سەرمایەداریی کۆلۆنیالی لەگەڵ مەسەلەی ناچارکردنی خەلکی ولاتی داگیرکراوەکە کار بۆ داگیرکەرانیان بکەن. لەبەرئەمە پێویست بوو لەگەڵ توزمینەیکاندا تێکەڵ بن، لەیەکتر بگەن، لەرێی ئایینو رێگەکانیتری پروپاگاندەوە کاریان تێبکەن، هەموو ئەمانە پێویستی بەلەیەکتر گەیشتنو بەوپێیە لێکۆڵینەوەو بەراوردکردنی زمان هەبوو.

بەم جۆرە پێداویستی‌یە پراکتیکی‌یەکانی چەرخی نوێ زەوی‌یان بۆ لێکدانەوەو تۆمارکردنی زمانان ئامادەکرد، دانانی فەرهەنگ، گراماتیك‌و لێکۆڵینەوەی تیۆری. بۆ زمانی وڵاتانی داگیرکراو ئەوە ئەو ئەرکە درا بەسەر ئەو میسیۆنیرە راهیبانەدا کەنێرران بۆ ئەو وڵاتانەی تازە داگیرکرابوون؛ تۆمارکراوەکانی ئەم میوسینێرانە زەمانێکی زۆر هەر تاقە سەرچاوەی زانینی ئەو زمانە هەمەجۆرانەبوون.

لەساڵی ١٥٣٨دا بەرهەمەکەی گڤیلسلم پۆستیللوس (١٥١٠-١٥٨١) ( DE affinitatae linguakrum) (لەبارەی خزمایەتیی زمان) دەوە پەیدابوو

یەکەم هەوڵدانی دانانی گروپی زمانە خزمەکانی یەك لەلایەن یوسف یوستوس سکالیگێر (١٥٤٠-١٦٠٩)دوە بوو، کوڕی زمانەوانی ناسراوی راپەرین یولیا – تسیراز سکالێگێر (١٤٨٤-١٥٥٨)بوو. لەساڵی ١٦١٠دا لەفەرەنسە کتێبی سکالیگێر ( Diatriaba de europeorum linguis) (موناقەشەی زمانە ئەوروپاییەکان، کەلەساڵی ١٥٩٩دا نووسرابوو) دەرچوو. لەوێدا لەسنووری دانەری بەناوبانگدا زمانە ئەوروپاییەکان بریتین لە١١ زمانی – دایك: چواری "گەورە – گریکی، لاتینی (بەرۆمانی‌یەوە)، تیڤتۆنی (گێرمانی)و سلاڤی، حەوت زمانی "بچووك – ئیپیرۆتی (ئەلبانی)، ئیرلەندی، کیمری (بریتی) بەبریتۆنی‌یەوە، تەتەری، فینلەندی بەلۆپاری‌یەوە، هەنگاری‌و باسکی. لەگەڵ ئەوەشدا کەئەم بەراوردە بەپێی بەراوردی وشەی بۆگ (خوا- و) بووە لەزمانی جیاوازداو تەنانەت ناوە لاتینی‌و گریکیەکەی خوداش (دێیوس، زیۆس) سکالیگێری نەبردۆتە سەر بیری خزمایەتیی زمانی گریکی‌و لاتینی بەڵکو هەموو ئەم ١١ دایکەی بەوە دانا کە"هیچ جۆرە خزمایەتی‌یەك لەنێوانیاندا نی‌یە".. لەسنووری زمانە رۆمانی‌یەکاندا بەتایبەتی گێرمانی‌یەکاندا دانەر توانیویەتی وردترین جیاوازی پلەی خزمایەتی بدۆزێتەوە، یەکێتیی زمانە گێرمانی‌یەکان پیشان بدات ئەوەش بەوەی کە"water" لەزمانەکانی (زمانی دایك خۆی و قسەی خوارووی ئەلەمانیاداو ئەوانیتریشداو "wasser" لەزمانەکانی (قسەی ئەڵەمانیی ژووردا) ([6]) مانای وایە تێبینی ئەوەی کردووە کەلەتوانادایە زمانە گیرمانی‌یەکان‌و دیالێکتە ئەڵەمانی‌یەکان

---

[6] ئەمە مانای وایە کەووشەیەك بەمانای "ئاو" لەیەکێك لەزمانە گیرمانییەکاندا "بەڤاتار"و لەوی تردا بە"ڤاسار" دەوترێت، یا دەبیسترێت.

بەنیشانەی جوڵاندنی نابزوێندا جیابکرێنەوە، ئەمە لەوەدوا لەبەرهەمەکانی تین – کات، راسموس راسك‌و یاکووب گریم دا پەرەی پێدراوە.

لەسەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا ئی. گیشار لەکتێبی (١٦٠٦) ( L,Harmonie etymologique des langues)و لەگەڵ موناقەشە خەیاڵی‌یەکەی زمان‌و نوسینیشدا، توانیویەتی خێزانی زمانە سامی‌یەکان پیشان بدات، ئەمە لەوە دوا لەلایەن عیبری زانەکانی ترەوە وەك یۆڤ لودۆلف (١٦٢٤-١٧٠٤) پەرەی پێدراوە.

فراوانترین پۆلینکردن، هەرچەندە لەزۆر لایەنەوە تەواو نی‌یە، بەلاّم دان پێدانانێکی ئاشکرای تێگەیشتنی خێزانەکانی زمان ئەوەی زانای گەورەی ماتماتیك‌و فەیلەسووف گۆتفرێد- ڤیلیهێلم لێینیتس (١٦٤٦-١٧١٦)ە، کەناوی ناسراوی زمانی دابەشکردووە بەسەر دوو خێزانداو هەریەکەشیانی دابەش کردۆتەوە بەسەر دوو گرووپدا:

١. ئارامی (واتە سامی)

٢. یافیتی

ا. سکێفی (فینلەندی، تورکی، مەنگۆلی‌و سلاڤی)

ب. کیلتی (ئەوروپی‌یەکانیتر)

ئەگەر لەم پۆلینکردنەدا زمانە سلاڤی‌یەکان ببەینە ناو گرووپی (کیلتی‌یەوە)و (سکێفی) هیچ نەبێ ناوبنێین " ئۆراڵە- ئالتایی"، ئەوا ئەوەمان دەست دەکەوێت کەزماناسەکانی سەدەی نۆزدەهەم گەیشتوونێ.

لەسەدەی حەڤدەهەمدا یوری کریژانیچ (١٦١٧-١٦٩٣) کەلەکرواتیاوە هاتبوو ساڵانێکی زۆر لەڕووسیا ژیابوو (بەشێوەی گشتی لەلادێ)، یەکەم نەخشەی بەراوردی زمانە سلاڤی‌یەکانی پێشکەش کرد؛ ئەم هەوڵدانە وردیی خۆیی تێدایە.

لەسەدەی هەژدەهەمدا لامبێرت تین – کات (١٦٧٤-١٧٣١) لەکتێبی ( Aenleiding tot de kenisse van net verhevende Deel der niederduitsche sproeke) دا (سەرەتای لێکۆڵینەوەی بەشی رەسەنی زمانی ئەڵمانیی خوراوو ١٧٢٣)

بەراوردێکی ڕاستەقینەی زمانە گێرمانی‌یەکانی کردووەو نەخشەی لەیەکچوونە گرنگەکانی دەنگی ئەم زمانە خزمانەی داناوە.

شتی زۆر گرنگ لەناو ئەوانەی پێشوودا لەمیتۆدی بەراوردی مێژووییدا بەرهەمەکانی م. ڤ. لۆمانۆسۆڤ (١٧٠٠-١٧٦٥) گرامـاتیکی رووسی (١٧٥٥) پێشەکی (لەبارەی سوودی کتێبەکانی کلێسە بەزمانی رووسی) (١٧٥٧)و کاری تەواونەکراوی، لەبارەی زمانە نزیکەکانی رووسی‌یەوەو لەبارەی دیالێکتەکانی ئێستاوە"، کەلەوێدا پۆلینکردنێکی تەواو وردی سێ گرووپی زمانە سلاڤی‌یەکان دراوە بەدەستەوە بەئیشارەتکردنی نزیکیی گەورەی رۆژهەلاتی لەباشووری‌یەوە، کەبەپیشاندانی ریزە وشەیەك دەرخراوە بەلەیەکچوونی راستی ئەتیمۆلۆژیی یەك رەگیی وشەی سلاڤی‌و گریکی، مەسەلەی پلەی نزیکیی دیالێکتە رووسی‌یەکان‌و جیابوونەوەی ئەلمانی‌یەکان، لەبارەی جێگەی زمانی سلاڤی کۆن‌و دەستنیاشنکردنی پێوەندیی خزمایەتی لەنێوان زمانە ئەوروپایی‌یەکانی بەشی زمانە هیندۆ ئەوروپایی‌یەکاندا.

بۆ بەجێهێنانی ئامۆژگاری لێیبنیتس، پەترۆسی یەکەم دیلی ناوچەی سوید فلیپ — یوهان ستڕالێنبێرگ (١٦٧٦-١٧٥٠)ی نارد بۆ سیبیریا بۆلێکۆڵینەوەی باری گەلان‌و زمان، ستڕالێنبێرگ ئەرکی خۆی بەجێهێنا. کەگەڕایەوە نیشتمان، لەساڵی ١٧٣٠دا خشتە (جدول)ێکی بەراوردیی زمانانی باکووری ئەوروپا، سیبریاو باکووری قەفقاسی بلاوکردەوە، لەوێدا بناغەی پۆلینکردنی گینۆلۆگیی گەلێك زمانی ناهیندو ئەوروپی دانراوە، بەتایبەتی زمانە تورکی‌یەکان.

لەسەدەی هەژدەهەمدا لەرووسیا، نەخشەی پەترۆسی یەکەم هێنرایەدی، کە (ئەکادیمیی رووسی) بوو (گمیلین، لێپێوخین، پاللاس‌و کەسانیتر) وەك ئێستا ناودەنرێت، دەستیان دایە لێکۆڵینەوەیەکی بەکۆمەڵی خاك‌و ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی رووسی. لەلایەنی جوگرافی‌و جیۆلۆجی ولاتەکە، ئاوو هەوا، ژێر زەوی، دانیشتوانی ولات‌و لەناو ئەوەشدا زمانی دەوڵەتی تیرە جیاجیاکان کۆڵینەوە.

ئەمە دوایی لەفەرهەنگێکی وەرگێڕاوی بەراوردکاریی گەورەدا کورتکرایەوە، کەچاپی یەکەمی لەساڵانی ١٧٨٦-١٧٨٧دا دەرچوو. ئەمە یەکەم فەرهەنگ بوو لەم جۆرە، کەلەژێر ناوی " فەرهەنگی بەراوردکاریی هەموو زمان‌و دیالێکتەکان"دا دەرچوو، کەرێگەی وەرگێڕانی وشەی رووسی بۆ هەموو زمانە ئاسانەکانی تێدا لەکەتەلۆگی

زمانان دا کۆکرایەوە بە٢٠٠ زمانی ئەورووپاو ئاسیا. لەساڵی ١٧٩١دا دووەم چاپی ئەم فەرهەنگە بەخستنە پاڵی چەند زمانی ئەفەریقاو ئەمەریکا دەرچوو (هەموو ٢٧٢ زمان بوو) [٧].

ئەو کەرەسەیەی بۆ وەرگێڕان بۆ ئەم فەرهەنگانە کۆکراوەتەوەو لەلایەن ئەکادیمییەکانو لەلایەن کارمەندانیتری ئەکادیمیای رووسییەوە، سەرنووسەران ئەکادیمیك پاللاسو بانکۆفیچ دی مارێیقو بوون، بەبەشداریی شەخسیی یکاترینی دووەم. بەم چەشنە بایەخێکی دەوڵەتی درابوو بەم فەرهەنگە.

دووەم فەرهەنگی ئەنالۆگی لەلایەن میسیۆنێرێکەوە بەناوی لۆرینسۆ بەرڤاس — ی پاندورۆ وەبوو کەیەکەم چاپی (ئیتاڵی)ی ساڵی ١٧٨٤ بەناوی ( Catalogo delle lingue conoscivte Notizia della loro affunitae diversita) وە دەرچوو، دووەم چاپی ئیسپانیی لەساڵانی ١٨٠٠-١٨٠٥دا بەناوی ( catalogo de las lenguas de las naciones ciones concidas) کەلەشەش بەرگدا زیاتر لە٤٠٠ زمان کۆکراوەتەوە بەهەندێك زانیاریو بەڵگەوە لەبارەی ئەم زمان یان ئەو زمانەوە.

دوا چاپی لەوانەچوو کاری ئەڵەمانی لای بەلتیق ی. خ. ئەدیلولگو ی.س. ڤاتێر (Mithridates, oder allgemeine Sprachkunde) (میتریدات، یا زمانناسیی گشتی)ە، کەلەساڵانی ١٨٠٦-١٨١٧دا دەرچووە، لەوێدا بیری راست جیاوازیی زمانەکانی بەبەستراوی بەکۆمەڵە تێکستێکەوە دەرخستووە کەبەپێی وەرگێڕانی دوعای ئۆتچای ئێمە بە٥٠٠ زمان نووسراوەتەوە؛ ئەمە وەرگێڕانێکی دەستکردی خەیاڵی بوو بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان. لەم چاپەدا بایەخێکی زۆر دراوە بەو پەراوێزانەی لەژێر وەرگێڕانەکانداو بەگراماتیكو بەڵگەیتر، بەتایبەتی تێبینییەکانی ڤ گۆمبۆلت لەبارەی زمانی باسکییەوە.

هەموو ئەم هەوڵانە بۆ "بەکەلەتۆگ کردنی زمانان"دا هەرچۆنێك بن ئاشکرایە، هەموو سوودێکی گەورەیان بەخشی: ئەمانە خەڵکیان ناساند بەکاتی راستەقینەی زمانانی

---

٧ خشتەی لاپەڕەکانی ئەم فەرهەنگە لەووشەی Cecmpa (خوشك)ەوە رەنگە لەلاپەڕەی (٤٧) کتێبی ڤ. تۆمسن "مێژووی زمانناسی تا دوای سەدەی نۆزدەهەم"دا ببینی. (وەرگێڕانی رووسی بەسەرنووسەریی ر. ئو. شۆر، ١٩٣٨).

هەمەجۆرو تواناى لەيەك چوون و جياوازيى زمان لەسنوورى ئەم وشە يا ئەويان دەرخستە ئەوەى يارمەتيى بايەخدانى دا بەبەراوردكارى لەيەكچوونى زمانان و شارەزايى بەربلاوى راستەقينەى لەم زمانانەدا دەولەمەند كرد.

هەرچەندە تەنها لەيەكچوونى ليكسيكا، بەلىٚ هيٚشتا بىٚ بوونى جۆرە تيۆرييەكى ميٚژوويى راستەقينە، نەيتوانيوە بگاتە ئەنجامى زانستيى پيٚويست، بەلاٚم زەوى بۆ سەرهەلدانى بەراوردكاريى زمانناسى ئامادەكرا.

هەرجۆرە پالٚ پيۆەنانيٚك پيٚويست بوو، كەريٚگەى راستى بەراوردكردنى زمان نيشان بدات و بناغەى مەبەستى پيٚويست بۆ ئەم چەشنە ليٚكۆلٚينەوەيە دانيٚت.

## ٧٧. ميتۆدى بەراوردكاريى – ميٚژوويى زمانناسى

ئەم پالٚ پيۆەنان يا لەرزاندنە لەدۆزينەوەى سانسكريتيدا[8] دەركەوت. كەزمانى ئەدەبيى كۆنى هيندستانە. بۆچى ئەم دۆزينەوەيە توانى ئەم رۆلٚە ببينىٚ؟ كار لەوەدايە، كەلەسەدەكانى ناوەڕاستدا يا لەچەرخى راپەڕينى هيندستاندا بەولاٚتيٚكى ئەفسانەيى زانراوە. كارى عەجايبى تەواو، لەرۆمانى كۆنى (ئەليدكساندەريا)دا وەسفكراوە، ماركۆ پۆلۆ كەلەسەدەى ٨ ى ز دا گەشتى هيندستانى كردووە، ئەفاناسيانيكيتين لە(سەدەى ١٥هەمى ز)دا، ئەو وەسفانەى ئەوان كردوويانە هەرگيز، ئەفسانەيان لەبارەى وولاٚتى زيٚڕو فيلى سپىيەوە دەرنەخستووە.

يەكەم كەس كەلەيەكچوونى وشەى هيندى و ئيتالٚى و لاتينى تىٚبينى كردووە، فيليپۆ ساسيتنيى گەڕۆكى ئيتالى بوو لەسەدەى ١٦ى ز دا، ئەمەى (لەچەند نامە لەهيندستان)ەوەى خۆيدا بلاٚوكردەوە، هەرچەندە ئەنجامى زانستى لەم بارەيەوە دەرنەخرا.

---

٨سانسكريت –Sanskria- بەهيٚندى كۆن "قالٚبوو"، لەبارەى زمانەوە بەرامبەر بە "پراكروتا"-Prakrta – "ساكارە".

مەسەلەکە باری راستەقینەی خۆی تەنیا لەنیوەی دووەمی سەدەی ١٨هەمدا درایە، کەلەکەلکەتا ئینستیوتی روناکبیریی رۆژهەلات دامەزراو ولیام جۆنز (١٧٤٦-١٧٩٤)، لەدەستنووسە سانسکریتی‌یەکان کۆلی‌یەوەو بەزمانە هاوچەرخەکانی هیندستان ئاشنابوو وتوانی بنووسێ:

(زمانی سانسکریتی، کۆنێکەی هەرچەندێك بێت، هەر بینایەکی سەیری هەیە، زۆر تەواوترە لەزمانی گریکی، زۆر دەوڵەمەندترە لەزمانی لاتینی، زۆر جوانترە، لەهەردووکیان، بەلام لەخۆیدا شتێکی زۆری خزمایەتیی لەگەڵ ئەم دوو زمانەدا پاراستووە چ لەرەگی فرماندا، چ لەفۆرمی گراماتیکدا، کەناتوانرێ بڵێین بەرێکەوت دروستبووە، خزمایەتی‌یەکە ئەوەندە بەهێزە، کەهیچ زمانەوانێك، کە لەلێکۆڵینەوەی ئەم سێ زمانە بزانێت، ناتوانێ باوەر بەوە نەکات، کەهەموویان هەر لەیەك سەرچاوەی گشتی‌یەوە هاتوون، کەلەوانەیە جارێکیتر نەبێتەوە. بناغەیەکی ئەنالۆگی هەیە، کەتەواو قەناعەتت پێناکات، وافەرز دەکات، کەزمانی گۆتی‌و کیلتی، بەتێکەلیشیانەوە لەگەڵ دیالێکتی تەواو جیاوازدا، هەر لەو نەژادەوە هاتوون، کەسانسکریتیی لێوەهاتووە؛ دەتوانرێ فارسیی کۆنیش ببرێتەوە سەر ئەم خێزانانەی زمان، ئەگەر لێرەدا جێگەی موناقەشەی مەسەلەکانی کۆنیی فارسی بێت)

سەرەتای بەراوردکاریی زمانناسی بەمە دامەزرا، بەرەوپێشچوونی لەمەو دوای‌و زانست بەشێوەی بانگەوازیش بێت، بەلام بەراستی بیروراکانی ڤ. جونزیان سەلماند.

شتی سەرەکی لەبیرەکانیدا:

١. لەیەکچوون هەر لەرەگدا نی‌یە، بەلکو لەرووخساری گراماتیکیشدا کەئەمە لەوانە نی‌یە بەرێکەوت هاتبێت.

٢. ئەمە خزمایەتیی ئەو زمانانەیە، کەلەیەك سەرچاوەی گشتی‌یەوە هاتوون.

٣. ئەم سەرچاوەیە، "لەوانەیە ئیتر دروست نەبێتەوە".

٤. لەپاڵ سانسکریتی، گریکی‌و کێلتی و زمانە ئێرانی‌یەکانیش پێوەندی‌یان بەم خێزانانەی زمانەوە هەیە.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بۆ پێوەندی لەگەڵ یەکدا زانای جیاوازی وڵاتی جیا خەریکی روونکردنەوەی پێوەندیی خزمایەتیی زمانان بوون لەسنووری ئەم یا ئەو خێزانداو ئەنجامی باشیان دەستکەوت.

فرانس بۆپ (١٧٩١-١٨٦٧) لەبیروڕاکانی ڤ. جۆنزەوە یەکسەر دەستیپێکردو لەمیتۆدی بەراوردکاریی گەردانی فرمانە بنەڕەتی‌یەکان لەسانسکریتی، گریکی، لاتینی‌و گۆتی (١٨١٦) لەبەرابەری رەگ‌و گەردان (تەسریف — و) ی دەرخست، کەئەمە لەرووی میتۆدۆلۆجی‌یەوە نرخی تایبەتیی هەبوو، هەروەك لەیەکچوونی رەگ‌و وشە بۆ بڕیاردانی خزمایەتیی زمان تەواوکار، نادات بە دەستەوە.

ئەگەر کەرەسەی دووا روخساری گەرنداندکردن هیوایەکی ئەوتۆ بدات بەمەزندەکانی لەیەکچوونی دەنگ، ئەوا بەهیچ جۆرێك ناگونجێ وەرگرتن (اقتباس)ی بخرێتە سەر، بەمجۆرە ئەمە خزمەتی زامنکردنی تێگەیشتنی راستیی هاوپێوەندیی زمانە خزمەکان دەدات. تەنانەت بۆپ لەسەرەتای چالاکیی خۆیدا لای وابوو کە(زمانی زگماك)ی زمانە هیندۆ ئەوروپاییەکان سانسکریتی بێت، هەتا درەنگ خەریکی ئەوەبوو زمانی نامۆی وەك مەلایۆیی‌و قەفقازیش بخاتە ناو جوغزی خێزانە هیندۆ ئەوروپی‌یە خزمەکانەوە. بەڵام لەکارە بەرایی‌یەکانیداو لەوانەی دواییدا بەڕەنگدانەوەی کەرەسەی زمانە ئێرانی، سلاڤی، بەلتیقییەکان‌و زمانی ئەرمەنی، بۆپ بەپێی کەرەسەیەکی زۆری لێکۆڵینەوە باسە بڵاوکراوەکەی ڤ. جۆنزی سەلماندو یەکەم گراماتیکی بەراوردکاریی زمانە هیندۆ گێرمانی (هیندۆ ئەوروپی)یەکانی نووسی (١٨٨٣).

زانای دانیمارکی راسموس کریستیان ڕاسك (١٧٨٧-١٨٣٢) بەرێگەیەکیتردا پێش ڤ. بۆپ کەوت. ڕاسك بەهەمموو جۆرێك ئیشارەتی ئەوەی کرد، کەلەیەکچوونی لێکسیکی لەنێوان زمانانددا چاوەڕێ ناکرێت، ئەوەی زۆرگرنگترە ئەوە لەیەکچوونی گراماتیکی‌یە، چونکە وەرگرتن‌و ئاڵوگۆڕی وشە، بەتایبەتی گەردانکردن، "هەرگیز نابێت".

ڕاسك کەلێکۆڵینەوەکەی بەزمانی ئایسلەندە دەستپێکرد، ئەو زمانەی پێش هەموو زمانێکیتر لەگەڵ زمانە ئەتڵەنتیکی‌یەکان دا بەراورد کرد: گرینادی، باسکی، کێلتی — رەفزی خزمایەتیانی کرد (تاڕادەیەك ڕاسك لەمەودووا بیری خۆی لەبارەی کێلتی‌یەوە گۆڕی) پاشان ڕاسك بەراوردی زمانی ئایسلەندیی (یەکەم جوغز) لەگەڵ هەرە خزمی نزیکدا کرد

کەنەرویجی‌یە بەمە جوغزی دوەمی دەستکەوت؛ ئەو بەراوردی دووەم جوغزی لەگەڵ زمانە سکەندیناڤی‌یەکانیتردا کرد (سویدی، دانیمارکی (سێیەم جوغز) پاشان لەگەڵ زمانە گێرمانی‌یەکانیتردا (چوارەم جوغز) لەکۆتاییدا بەراوردی جوغزی گێرمانیی لەگەڵ جوغزە لەیەکچووەکانیتردا بەگەڕان بەدوای "فراکی"دا (واتە جوغزی هیندۆ ئەوروپیدا کرد، بەراوردی نموونەکانی گێرمانیی لەگەڵ ئەوشتانەدا کرد کەلەزمانی گریکیو لاتینیدا دیارن).

بەداخەوە ڕاسك بەلای سانسکریتیدا نەچوو تەنانەت پاش ئەوەش کەچووە رووسیاو هیندستان؛ ئەمە "جوغزە"کەی ئەوی تەسك کردەودو ئەنجامەکانیی کز کرد.

بەڵام چوونە سەر زمانە سلاڤی‌یەکانو بەتایبەتی زمانە بەلتیقی‌یەکان زۆر بەشێوەی دیار ئەو کەلێنانەی پڕکردەوە.

ئا. مێیە (١٨٦٦-١٩٣٦) بەم چەشنە وەسفی بیریف. بۆپ و ر. ڕاسك دەکات.

" ڕاسك زۆر بەگەورەیی لەوەدا دان بەبۆپدا دەنێ، کەنزیك سانسکریتی نەکەوتووە؛ بەڵام لەبنەڕەتەوە لەیەکچوونی نزیکیی زمانان پیشان دەدات، زۆر خۆی بەهەوڵدانی بێ کەڵکی روونکردنەوەی روخساری یەکەم سەرەتاوە خەریك ناکات؛ ئەو رازی‌یە، بۆنموونە، بەسەلماندنی ئەوەی " هەموو کۆتاییەکی زمانی ئایسەلەندی ردنگە بەدیمەنێکی زۆر یا کەم روونائ لەزمانی گریکی یا لاتینیدا دەربکەوێت"، لەم بارەیەوە ئەم کتێبە زیاتر زانستی‌یەو کەمتر لەناوچووە، وەك لەبەرهەمەکەی بوپ [9]: دەبێ بڵێین، بەرهەمەکەی ڕاسك ساڵی ١٨١٨ بەزمانی دانیمارکی دەرچووە تەنیا بەکورتکراوەیی بەزمانی ئەڵمانی ساڵی ١٨٢٢ چاپکراوە (وەرگێڕانی ی. س. فاتێر)

سێیەم دامەزرێنەری میتۆدی بەراوردکاری لەزمانەوانیدا ئا. خ. ڤۆستۆکۆڤ (١٧٨١-١٨٦٤) بووە.

ڤۆستۆکۆڤ تەنیا بەزمانە سلاڤیکانەوە خەریکبوو، پێش هەمووشیان بەزمانی سلاڤی کۆنەوە، کەدەبێ جێگەی لەناو جوغزی زمانە سلاڤی‌یەکاندا دەستنیشان بکرێت.

---

٩ئا. مێیە، سەرەتایەکی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریی زمانە هیندۆ ئەوروپاییەکان، وەرگێڕانی رووسی، مۆسکۆ، ١٩٣٨، ل٤٥١.

٧ لە زمانی زیندووی پۆڵۆنیدا مانای دەنگداری لووتی (ê- ę - ŏ) یە

بەبەراوردکردنی رەگ و روخساری گراماتیکیی زمانە سلاڤییەکان لەگەڵ بەڵگەکانی زمانە سلاڤییە کۆنەکاندا، ڤۆستۆکۆڤ توانی زۆر لەو راستییانەی ناو یادگارە نووسراوە سلاڤییانە بزانێت کەپێش خۆی تێیان نەگەیشتبوون. بەمجۆرە، چاکەی زانینی نهێنی یووس (دەدرێتە پاڵ ڤۆستۆکۆڤ، ئەودش تیپی (Ѣ)ە کە ئەو بەمانای دەنگداری لووت، بەپێی ئەم بەراوردە، دەستنیشانی کردووە.

| پۆڵۆنی(٢٠) | رووسی | سلاڤی |
| --- | --- | --- |
| | | کۆن |
| دابی | دووب | ДѢБЪ |
| پییج | پیات | ЛАТб |

ڤۆستۆکۆڤ سەرەتا ئەوەی بەپێویست زانی کەبەراوردی ئەو زانیاریانەی لەیادگاری زمانە مردووەکاندایە لەگەڵ فاکتی زمان و دیالێکتە زیندووەکاندا بکرێت، ئەمە پاشان بوو بەمەرجی پێویستی کاری زمانەوانەکان لەنەخشەی بەراوردکاریی – مێژووییدا. ئەمەبوو بەوشەیەکی نوێ لەدامەزراندن و گەشەسەندنی میتۆدی بەراوردکاریی – مێژووییدا.

زیاد لەمە، ڤۆستۆکۆڤ بەپێی کەرەسەی زمانە سلاڤییەکان ئەوەی پیشاندا کەلەخۆیدا لەیەکچوونی دەنگە لەزمانە خزمەکاندا، بۆنموونە وەك، ئەنجامی پێکەوە لکانی (tj,dj) لەزمانە سلاڤییەکاندا (بڕوانە (K ħyα)ی سلاڤی کۆن، (Bзщт) ی (بۆلگاری) "بەمانای نوێ، تازە، پاك – وەرگێر)، یا (Cβeђa) (سڤێها)ی سیربی کرواتی، Sviceی چیکی Swieca ی پۆلۆنی، ebeлaسڤێچای رووسی- کەلە(svétja)ی سلاڤیی گشتییەوە هاتوون؛ هەروەها (Meжda) (مێژدای سلاڤیی کۆنmeжә ی بۆلگاری Meηaی سربیی کرواتیی ، (Mez)ی چیکی، (Miedza)ی پۆلۆنی (Meжa)ی رووسی

له(Medja)ی سلاڤیی گشتی‌یه‌وه هاتوون، هه‌رروه‌ها (Mexga)(مێژا- به‌مانا- سنوور- وه‌رگێڕ) له‌یه‌کچوونی روخساری ته‌واو ده‌نگداری رووسیی جۆری ( ςolob, ςopod) گۆرمرد، گۆلەڤا: به‌مانا: شار، سەر- وه‌رگێڕ) (به‌راورد بکه له‌نێوان (Градy)ی سلاڤیی کۆن، (ςpáJ)ی بۆلگاری

(ςpáJ)ی سربیی کرواتی، (hrad)ی چیکی (قفل، کرملین) (grod)ی پۆلۆنی له(grod) ی سلاڤیی گشتی‌یه‌وه، یا (Γλακα)ی سلاڤیی کۆن،

( ςλαβα)ی بولگاری ( ςλαβσ)ی سربیی کرواتی، (hlava)ی چیکی (glowa)ی پۆلۆنی – له‌(glova) ی سلاڤیی گشتی‌یه‌ودو به‌و جۆره) هه‌روه‌ها میتۆدی سه‌رله‌نوێ بنیادنانه‌وه‌ی دینه کۆنه‌کان یا رووخساره کۆنه‌کان که‌نوێنه‌ری ده‌ستپێکردنی روخساره نه‌ك ئه‌و یادگاره نووسراوانه‌ی ده‌بنه به‌ڵگه‌.

کاری ئه‌م زانایانه‌ی میتۆدی به‌راوردکاری له‌زمانه‌وانیدا هه‌ر ئه‌وه‌نده‌بوو که‌ئیعلان بێت، به‌ڵکو میتۆدو ته‌کنیکی خۆیشیان پیشاندا.

کاری چاکی وردبوونه‌وه‌و پته‌وکردنی ئه‌م میتۆده به‌پێی که‌ره‌سه‌یه‌کی زۆری به‌راوردکردنی زمانه هیندۆ ئه‌وروپی‌یه‌کان ئه‌وه کاری ئاڤگۆست – فریدریخ پوت (١٨٠٢-١٨٧٠)ه که‌خشته‌یه‌کی به‌راوردی ئێتیمۆلۆژیی زمانه هیندۆ ئه‌وروپی‌یه‌کانی کردووه‌و به‌دڵنیاییه‌وه گرنگیی لێکۆڵینه‌وه‌ی له‌یه‌کچوونی ده‌نگی کردووه‌.

له‌م کاته‌دا زانای جیاجیا به‌شێوه‌یه‌کی تازه وه‌سفی فاکتی زمانه خزمه جیاوازه‌کانی گرووپه‌کان‌و لقه‌کانیان کردووه‌.

له‌مانه کاری ئیۆگاهان – که‌سپه‌ر تسیبس (١٨٠٦-١٨٥٥)ه‌، له‌باره‌ی زمانی کیلتی‌یه‌وه‌، هه‌روه‌ها فریدریخ دیتس (١٧٩٤-١٨٧٦) له‌باره‌ی زمانی رۆمانی‌یه‌وه‌، کاری گێۆرك کورتسیوس (١٨٢٠-١٨٨٥) له‌باره‌ی زمانی گریکی‌یه‌وه‌، هه‌روه‌ها یاکووب گریم (١٧٨٥-١٨٦٨) له‌باره‌ی زمانی گێرمانی‌یه‌وه‌، به‌تایبه‌تی له‌باره‌ی زمانی ئه‌ڵه‌مانی‌یه‌وه‌، هه‌روه‌ها تیودۆر بێنفێ (١٨١٨-١٨٨١) له‌باره‌ی سانسکرتی‌یه‌وه‌و فرانیشك میکلۆشیچ(١٨١٨-١٨٩١) له‌باره‌ی زمانه سلاڤی‌یه‌کانه‌وه‌و ئاڤگوست شلێیهێر(١٨٢١-١٨٦٨) له‌باردی زمانه به‌ڵتیقی‌یه‌کان‌و

زمانی ئەڵەمانی‌یەوە ف. ی بوسلایف (١٨١٨-١٨٩٧) لەبارەی زمانی رووسی‌یەوەو زانایانی تریش.

گرنگیی تایبەتی لێوردبوونەوەو داچەسپاندنی میتۆدی بەراوردکاری لەکاردکانی قوتابخانە رۆمانی‌یەکەی ف. دیتسدایە. تەنانەت تەتبیقی میتۆدی بەراوردو سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی نموونە کۆنەکان بوو بەشتێکی ئاسایی لای زمانەوانەکان، بەڵام بەشێوەیەکی ردوا بیریان بەلای گومانکردندا نەچووود، هەرچەند بەلێوردبوونەوەی راستەقینەی میتۆدی نوێ زانای رۆمانی ئەم چەشنە لێوردبوونەوەدیەی لەلێکۆڵینەوەکانیدا بەکارهێناوە.. نموونە کۆنە رۆمانی‌یە لاتینی‌یەکان، لەقوتابخانەی دووبارە بوودی ف. دیتسدا، بەفاکتی تومارە نووسراوەکانی بلاوکراوە میللی‌یە لاتینی‌یەکانی زمانی سەرەتایی زمانە رۆمانی‌یەکان سەلێنراوە.

بەم چەشنە، سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی بەلگەکانی میتۆدی بەراوردکاریی-مێژوویی، لەراستیدا سەلێنران. بەئەوەی مێژووی کورتی گەشەسەندنی زمانەوانیی بەراوردکاریی مێژوویی تەواوبکەین دەبێ پەل بۆ نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمیش بهاوێژین.

ئەگەر لەسی‌یەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، وەك دەبوو وابێت ئەو زانایانەی گەشەیان بەمیتۆدی بەراوردکاری دا، لەفەرزکردنە رۆمانتیکی‌یە ئایدیالیستی‌یەکانی (برایانی فریدریخو ئاڤگوست- ڤیلهێلم شلێگیل، یاکووب گریم، ڤیلهێلم گومبۆلدت)دوە دەستیان پێکردووە، ئەوا لەناوەڕاستی سەدەکەدا رێبازی دیار لەسەر بناغەی مەتریالیزمی زانستیی راستەقینە دادەمەزرێت.

بەخامەی زمانەوانی گەورەی سالانی ٥٠-٦٠ی سەدەی نۆزدەهەم، ئاڤگوست شلێیهێر (١٨٢١-١٨٦٨)ی نەتورالیست (سروشتی تەبیعی — و-) ی داروینی دەربڕینی مەجازیی رۆمانتیکەکان "ئۆرگانیزمی زمان" "لاوی، پێگەیشتنو نشێوی زمان" " خێزانی زمانە خزمەکان — گرنگی‌یەکی یەکسەریی هەیە.

بەباوەڕی شلێیهێر، زمان — ئۆرگانیزمێکی سروشتی‌یە، رەوەك و وەکو ئاژەڵ، لەدایك دەبێت، پەرە دەسێنێتو دەمرێت، هەموو زمانێك زنجیرەی پشتاو پشتو شەجەرەی

خۆی هەیە، وەك هەموو بوویەکی زیندوو، بەباوەڕی شلێیهێر، زمان گەشە ناسێنێت بەڵکو دەڕوێتو نەشونوما دەکاتو سەر بەیاسای سروشتە.

ئەگەر بۆپ شتێکی نادیاری لەبارەی یاساکانی تەتبیقی زمانەوە لەبەرچاو بوو بێتو وتبێتی، " نابێ لەزماندا بەدوای ئەو یاسایانەدا بگەڕێین، کەتوانیویانە بەربەرەکانی‌یەکی توندی زیاتر لەکەناری رووبارو زەریا پیشان بدەن" ئەوا شلێیهێر باوەڕی وابوو کە" ژینی ئۆرگانیزمیی زمان بەشێوەی گشتی بەیاسای دیاری راستو پلە بەپلەی گۆڕان پڕوتەواو دەبێت )[١٠] هەروەك باوەڕی بەکاریگەریی "ئەم یا ئەو یاسا هەبوو لەکەناری سین لەسەر ئەوەی کەنار هیندۆس یاگانا".

لەو بیرەوە کە"ژیانی زمان لەهیچ روویەکەوە لەژیانی ئۆرگانیزمە زیندووەکانیتر- رووەكو ئاژەڵ جیاناکرێتەوە" شلێیهێر تیۆری خۆی دادەمەزرێنێت، تیۆریی "درەختی پشتاو پشت" کەهەر لاقەو هەر پەلکە هەمیشە دەکرێت بەدوو بەشەوە، زمانیش دەبرێتەوە سەر سەرچاوەی یەکەمی – زمانی زگماك، " ئۆرگانیزمی سەرەتایی" کەدەبێ لەیەکچوونو رێكوپێکی دەسەڵاتداربێت، هەموو ئەمەش دەبێ سادەبێت، لەبەرئەوە شلێیهێر ڤۆکالیزم (دەنگی نەرم – المد- و-) لەسەر نموونەی سانسکریتی‌دا دامەزرێنێتەوە، کەچی کۆنسۆنانتیزم (نابزوین‌و-) بەنموونەی گریکی نەخشە دەکێشێ، ئیعرابو گەردانکردن بەیەك نمونە یەکدەخات، هەروەك نموونەی زۆری دەنگو فۆرم، لای شلێیهیر، ئەنجامی نەشونماکردنی لەمەودووای زمانە، لەئەنجامی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەدا شلێیهێر تەنانەت باسنیا (حیکایەتی ئەفسانە – و )یەکیشی بەزمانی هیندۆ ئەورووپیی زگماك نووسی.

شلێیهێر ئەنجامی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریی- مێژوویی خۆی لەساڵانی ١٨٦١-١٨٦٢ لەکتێبێکدا بەناوی " کۆمپێندیووم([١١]) گراماتیکی بەراوردکاری زمانە هیندۆ ئەورووپی‌یەکانەوە چاپکرد.

---

١٠ئاثا.شلبدیهێر، نامەیەکی کراوە ب دوکتۆر ئیرنست هیگڵ "تیۆریی داروین‌و بەکارهێنانی لەزانستی زماندا"، ١٨٦٤.

١١الەووشەی (compendium)- "پیشاندانێکی کورتکرراوە"وە.

لێكۆڵینـەوەكانی لەمـەودووای قوتابیـەكانی شـلێیهێر جێگیرنـەبوونی بۆچـوونی ئـەویان لەبەراوردی زمانەكان‌و سەرلەنوێدامەزراندنەوەدا سەلماند.

یەكەم وادەرخرا، كە"سادەیی" تەركیبی دەنگ‌و فۆرمی زمانە هیندۆ ئەوروپی‌یەكان – ئەنجامی سەردەمێكی دواییە، كاتێك ڤۆكالیزمی دەوڵەمەنـدی كۆن لەسانسكریتیدا و كۆنسـۆتانتیزمی دەوڵەمەنـدی پێشـوو لـەزمانی گریكیـدا، كورتكراونەتـەوە. شـتەكە بەپێچەوانەوە دەرچوو، كەرەسەكانی ڤۆكالیزمی دەوڵەمەنـدی گریكی‌و كۆنسۆنانتیزمی دەوڵەمەنـدی سانسكریتی- رێگەیـەكی راسـترە بـەرەو دامەزراندنـەوەی زمـانی زگمـاكی هیندۆ ئەوروپی (لێكۆڵینـەوەكانی كۆللیتس‌و ی. شمیـدت، ئەسكۆلی‌و نیككا، ئۆسـترۆڤ، بـروگمان، لێسكین، لەمـەودواش ف. دی سۆسـیۆر، ف.ف. فورتونـاتۆڤ ی. ئـا. بوویـان دی كورتینی‌و كەسانیتر).

دووەم " یەك نموونەیی فۆرم"ی سـەرەتایی زمـان زگمـاكی هینـدۆ ئـەورپی گومـانی لەلێكۆڵینــــەوەكانی مەیــــدانی زمانــــە بــــەلتیقی، ئێرانــــی‌و زمانــــە هینــــدۆ ئەوروپی‌یەكانیتریشدا دەرخست، بەمجۆرە زمانە زۆر كۆنەكان توانیویانـە هەمـەرەنگترو هەمە فۆرمتر بن لەنەوە مێژوویی‌یەكانی خۆیان.

"گراماتیكی‌یـە لاوەكـان" وەك قوتابیـەكانی شـلێیهێر خۆیـان نـاو نـاوە، خۆیـان بەرامبـەر بـە"گراماتیكی‌یـە كۆنـەكان" دانـاوە، كەنوێنـەری نـەوەی شـلێیهێرن، لـەپێش هـەموو شـتێكەوە خۆیــان بــەبێ بــەری دانــا لــەدۆگمای ناتوراليســتی (زمــان – ئۆرگــانیزمی سروشــتی‌یە) كەمامۆستاكەیان دانی پێدا نابوو.

گراماتیكی‌یە لاوەكان (پـاوڵ، ئۆسـتگۆڤ، بروگمـان، لێسـكین‌و ئـەوانیتر) نـەرۆمانتیك بوون، نەنەتوراليست، بەڵكو لە" باوەڕ بەفەلسەفە نەبوون" دا پشتیان بەپۆزیتیڤیزم " ئیجابیـەت- وەزعیـەت – و- " ی ئۆگسـت كانـت‌و بەسـایكۆلۆژیی بەكۆمـەڵی گێربـرات بەست.

"هاتنـــەوەهۆش" فەلســـەفەیی، چـــاكتر، ئیشـــارەتی هەڵوێســـتی دژ بەفەلســـەفەی گراماتیكی‌یـە لاوەكـانی كـردووە، كەپێویسـت نـی‌یـە رێـزی لێ بگـیرێ، بـەلام ئـەنجامی

پراكتیكی لێكۆڵینەوەی زمانەوانیی ئەم هەموو چرا گەشە زانایانەی وڵاتانی جیاجیا دەریخست كەزۆر لەگەڵ واقیعدا دەگونجێن.

لەم قوتابخانەیەدا ئەو دروشمە بەرزكراوەتەوە، كەیاساكانی فۆنەتیك (بڕوانە ئەسڵی ٧، بەشی ٨٥) هەموو كاتو هەمیشە وەك یەك كارناكەنە سەر شت (وەك شلێیهێر بیری كردبوۆوە) بەڵكو لەسنووری زمانێك یا دیالێكتێكی تایبەتیدا لەسەردەمێكی دەستنیشانكراودا كاردەكەن.

كارەكانی ك. ڤێر نێر (١٨٤٦-١٨٩٦) ئەوەیان دەرخست، كەلادانو لابردنی یاساكانی فۆنەتیك خۆیان وان لەژێر كاری ئەو یاسا فۆنەتیكیانەدا. لەبەرئەوە وەك ك. ڤێرنێر دەڵێ " دەبێ، وەك دەڵێن، بنەڕەتێك هەبێت، بۆ شتێك كەراست نیيە، تەنیا پێویستە ئەو ناراستیيە بدۆزرێتەوە"

لەپاڵ ئەوەدا (لەكارەكانی بۆدیان دێ كورتێنی، ئۆستگۆڤو بەتایبەتی لەكارەكانی گ. پاول دا ئەوە پیشاندراوە، كەئەنالۆگیا (لەیەكچووو-و-) جۆرە رەواییيەكە لەگەشەسەندنی زماناندا، وەك یاساكانی فۆنەتیك.

بەشێوەیەكی جیاكارە وردەكانی ف. ف. فۆرتوناتۆڤو ف. دێ سۆسیور جارێكیتر هێزی زانستیی میتۆدی بەراوردكاری مێژووییان سەلماند.

هەموو ئەم كارانە پشتیان بەبەراوردی مۆرفیم و فۆرمی جیای زمانە هیندۆ ئەوروپییەكان بەستووە. بەتایبەی بایەخ دراوە بەبینای رەگە هیندۆ ئەوروپییەكان كەلەسەردەمی شلێیهێردا لەبەراورد لەگەڵ تیۆریی هیندیی "سەركەوتن" سەیری سێ دیمەن كراوە: ئاسایی، بۆنموونە (vid) لەپلەی یەكەمدا سەركەوتنی (guna- ved)و لەپلەی دووەمدا سەركەوتنی (evrddhivayd) وەك سیستمێكی ئاڵۆزیی رەگی سەرەتایی سادە. لەبەر رۆشنایی دۆزینەوەی نوێ لەمەیدانی ڤۆكالیزمو كۆنسۆنانتیزمی زمانە هیندۆ ئەوروپییەكاندا، كەلەیەكچوونو جیاوایی لەتەركیبی دەنگی ئەو رەگانەدا هەیە لەگرووپی جیاوازی زمانە هیندۆ ئەوروپییەكانو لەزمانانی جیاوازدا، هەروەها بەبەرچاوگرتنی باری نەبرە ( odapeHua ) یا ئەوەی توانا هەیە ببێت بەگۆڕینی دەنگ، مەسەلەی رەگی هیندۆ ئەوروپی بەجۆرێكیتر دەخرێتەڕوو:

لەسەرەتادا وێنە زۆر پڕتری رەگیان هێناوە، کەلەپێکەوەلکاندنی نابزوێن‌و دوو دەنگی (دیفتۆنگ) پێکهاتووە (زیادەی کەرتیی دەنگدار i,u,n,m,y,v) بەهۆی سووککردنەوە (کەبەستراوە بەئەکسینتۆلۆگی‌یەوە) توانیان دەرکەون‌و بەکزکردنی جۆری رەگ لەپلەی یەکەمدا (i,u,n) بێدەنگدار، دوایی لەپلەیدووەمدا : سفر لەگەڵ (i,u,n,m,r,l) دەنگدار نی‌یە. بەلام ئەمە تا دووایی هەندێك رووداو روون ناکاتەوە، کەبەستراون بەوەوە کەپێی دەڵێن "درزی ئیندۆگێرمانیکۆم" واتە دەنگی کزی بێسنوور کەوەك a دەربڕراوە.

ف. دێ. سوسیور لەکارەکەی خۆیدا (memovie sur ie systeme PrimiJifdes Voylles dans Les langues indoeoyopeensu) ی ساڵی ١٨٧٩دا، کەلەیەکچوونی جیاجیای بەنۆرەی رەگی دەنگداری زمانە هیندۆ ئەوروپی‌یەکان دەکۆڵێتەوە، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ( )ش دەتوانی ببێت بەرەگەزی بێدەنگی دوو دەنگی (دیفتۆنگ)، بەلام لەحاڵی سووککردنی تەواوی رەگەزی بێدەنگیدا دەتوانێ ببێت بەبڕگەی دەنگدار. بەلام هەروا وەك هەموو چەشنێکی "هۆی سۆناتەیی" لەزمانە هیندۆ ئەووروپی‌یە جیاوازەکاندا هەیە وەك (é) یا (à)، یا فەرزکردنی بەدوای یەکدا، کە(درز) خۆی وێنەی جیاوازی هەیە (é-ę) سۆسیور هەموو ئەنجامەکانی نەداوە بەدەستەوە، بەڵکو ئەوەی فەرزکردووە، کەدەبڕینی (جەبری)ی هۆی سۆناتەیی) ( A , O ) کاتێك لەیەك دەچن کەئەوشتەی بەدەسەوە نایەت یەکسەر بەداڕشتنەوەی رەگەزی دەنگدار، بەلێکدانەوەی (حساب) ئیتر لەتوانادا نابێت.

پاش دڵنیابوون لەتێکستی میللیی لاتینی داڕشتنەوەی رۆمانی‌لەسەردەمی ف. دیتسدا ئەمە دووەم سەرکەوتنی میتۆدی بەراوردکاریی مێژوویی بوو، کەیەکسەر بەسترابوو بەپێش بینی‌یەوە، هەروەك پاش ئەوەی لەسەدەی بیستەمدا یادگارە نووسراوە هیتی‌یە بسماریەکان هەڵهێنران دەرکەوت، کەپاش نەمانی زمانی هیتی (نێسیتی) لەهەزار ساڵی پێش زایینداً ئەم رەگەزە دەنگی‌یانە ماونەتەوەو ئەوانە وەك (دەنگی قورگ) دەستنیشانکراون، کەنیشانەی (h) ی بۆدانراوە، لەکاتێکدا لەزمانە هیندۆ ئەوروپی‌یەکانیتردا لێکدانی he(دەبێ بە) é-ho دەبێ بە(Ỏ) بەلام (eh>eah>o/a) لەوێنەوە زۆر دەنگدارمان لەڕەگەوە دەستدەکەوێت، لەزانستدا ئەم

کۆمەڵەیە بە" خەمڵ لێدانی تیپی قورگ" بەناوبانگە. ژمارەی ئەو " تیپی قورگ"انەی نەماون لای زانایان وەك یەك نییە [12]

لەبارەی میتۆدی بەراوردکاریی مێژووییەوە ف. ئەنگلز لەئەنتی دۆهرینگ دا نوسیویەتی:

" بەلام جارێك کاك دۆهرینگ لەنەخشەی بیروڕای خۆیدا گراماتیکی مێژوویی هاوچەرخ دەسڕێتەوە، بەو جۆرە لەفێربوونی زماندا لای ئەو تەنیا ئەو مۆدیلە کۆنە دەمێنێتەوە کەلەستیل (ئەسلووب)ی فیلۆلۆژیی کلاسیکیی کۆندا مۆمیاکراوە، گراماتیکی تەکنیکی بەهەموو سەفسەتەو ئارەزووگەرییەوە بەستراوە بەنەمانی بناغەی مێژووییەوە. ناحەزیی فیلۆلۆگیای کۆن دەیبات بەرەو ئەوەی کەناشیرینترین بەری ئەو بباتە پلەی "نوقتەی ناوەندیی لێکۆڵینەوەی راستەقینەی فێرکردنی زمان" ئاشکرایە کەئێمە کارمان بەفیلۆلۆگ هەیە، هەرگیز هیچمان لەبارەی ئەو زمانناسییە مێژووییەوە نەبیستووە، کەلەم ٦٠ساڵی دواییەدا (کتێبەکە ساڵی ١٩٦٧ چاپکراوە-و-) تواناو گەشەیەکی بەپیتی بەخۆیەوە دیوە ، هەر لەبەر ئەمە ئەوەی کاك دوهرینگ لەپلەی بەرزی رەگەزەکانی فێرکردنی هاوچەرخی لێکۆڵینەوەی زماندا بۆی دەگەڕێ لەلای بۆپ، گریم‌و دیتس نا، بەڵکو لای یادگارە بەختیارەکانی هێنیزێ‌و بێکێر بۆی دەگەڕێ ([13]) کەمێك زووتر هەرلەم بەرهەمەدا ف. ئینگلز پەنجە بۆ ئەوە رادەکێشێت کە " کەرەسەو فۆرمی زمانی زگماك" هەر ئەو کاتە لێی تێدەگەین، کاتی سەرهەڵدان‌و بەرە بەرە گەشەسەندنی دەدۆزرێتەوە، ئەمەش

---

[23] بڕوانە بەووردی "مەسەلەکانی میتۆدی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریی-مێژوویی زمانە هیندۆ ئەوروپییەکان،" ١٩٥٦، پاشکۆی ف ٣، ل ١٥٥و لاپەڕەکانیتر، هەروەها: ڤیاچ. س. ئیڤانۆڤ، زمانی هیتی، مۆسکۆ، ١٩٦٣، ل ٨٧ لاپەڕەکانیتر.

[24] ك.مارکس ف.ئینگلز، بەرهەمی تەواو چ، ٢. ب ٢٠، ل ٣٣٣-٣٣٤.

(٣) هەر ئەوێ

(٤) وەك خۆی بێ — قوتابخانەی پێش ئەقڵ —و-

(٥) ئا٠ مێیە ، سەرەتای لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریی زمانەهیندۆ ئەوروپیەکان ، ٠=و٠ ڕووسی ١٩٣٨، ل ٧٣ ( فراوانکردنەوەی نووسەر )٠

بایەخدان بەمانە نەبێت لەتوانادا نییە، یەکەم، خاسیتی فۆرمە لەناوچووەکەیو دووەم، زمانە زیندوو و مردووەکانی خزمی (٣)

دیارە، ئەم دەربڕینانە جێی پێویستی وەسفیو مێژوویی ئەو گراماتیکیە ناگرنەوە، کەپێویستیی پێش هەموو شتێکە بەتایبەتی لەقوتابخانەدا، ئاشکراشە کەئەم چەشنە گراماتیکە نابێ لەسەر بناغەی "یادگارە بەختیارەکانی" هێیزیو بێکێر" دابمەزرێتو ئینگلز زۆر بەووردی پەنجەی بۆ دابڕینی " گراماتیکی قوتابخانەی مندالان) (٤) ی ئەو سەردەمەو زانستی پێشکەوتووی ئەو چەرخە، کەلەژێر دروشمی هیستۆریزمدا گەشەی سەندبوو، لەنەوە نەناسراوەکەی کۆن درێژکردووە.

بۆزمانەوانە بەراوردکارەکانی کۆتایی سەدەی ١٩هەم-سەرەتای سەدەی ٢٠ هەم " زمانی زگماك" وورده وورده نابێت بەنەزانراو، بەڵکو هەر بەهۆی تەکنیکیی لێکۆڵینەوەی زمانانی هەبووی راستەقینە، کەبەروونی لای قوتابییەکانی ف. دێسوسێورو گراماتیکییە لاوەکان – ئەنتوان مێیە (١٨٦٦-١٩٣٦) پێك دێت.

"گراماتیکی بەراوردکاریی زمانە هیندۆ ئەورووپییەکان لەبارێکدایە، کەگراماتیکی بەراوردکاریی زمانە رۆمانییەکانی تێدابوو، ئەگەر زمانی لاتینیی نەناسرایە: تاقە راستی، کەجێگەی خۆی هەیە ئەوە لەیەکچوونی ئەو زمانانەیە کەدانیان پێدانراوە (٥)

بەدوو زمان دەڵێن خزم، کەهەردووکیان ئەنجامی بەرەو پێشچوونی ئەم زمان یا ئەو زمان بن، کەزور بەکارهاتبێ. کۆمەڵی زمانی خزمەکان شتێك پێك دێن کەخێزانی زمانی پێ دەڵێن (٦)

"میتۆدی گراماتیکی بەراوردکاری بۆ دارشتنەوەی زمانی هیندۆ ئەورووپی بەو وێنەیە بەکارناهێنرێت کەقسەیان پێکردووە، بەڵکو بۆدارشتنەوەی سیستەمێکی لەیەکچووی سنووردار لەنێوان ئەو زمانانەی لەرووی مێژووییەوە دانیان پێدانراوە (٧)

" بەکۆمەڵ ئەم لەیەکچوونە، ئەو شتە پێك دێنێت، کەپێی دەڵێن زمانی هیندۆ ئەورووپی (٨)

لەم موناقەشانەی ئا. مێیدا بێ بەبەرچاوەوە گرتنی ئەم هاتنەوە سەرخۆیەو ئەم ئەقڵ بەکارهێنانە دوو دیمەنی خاسیەتی پۆزێتیڤیزمی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمی بۆ دەردەکەوێت: ئەمەش یەکەم، ترسی فراوانیی زۆرو ئازایی داڕشتنەوە، نەویستنی هەوڵی لێکۆڵینەوە، کەبەرەو قووڵایی چەند چەرخ بچێت "ئەوەی قوتابیی ئا. مێیی- ف. دێ سوسیور لێی نەترساوە، بلیمەتانە تێبینی: خەمڵ لێدان تیپی قورگی کردەووە" دووەم، ناهیستۆریزمییە ئەگەر دان بەبوونی راستەقینەی زمانی بنەڕەتیدا نەنرێت، وەك سەرچاوەی بوونی بەردەوامیی ئەو لەمەودووای زمانە خزمەکاندا، ئەوە بەگشتی دەبێ هەموو ئەو هێنانە بەرچاو (تصور)ەی مێتۆدی بەراوردکاریی- مێژووییمان نەوێت" ئەگەر دان بەوەشدا بنێین، وەك مێیێ دەڵێت، کەوا "کاتێك بەدوو زمان دەڵێن خزم کە هەردووکیان ئەنجامی دوو بەرەوپێشچوونی ئەم یا ئەو زمان بن، کەلەمەوپێش بەکارهاتبن"، بەو جۆرە دەبێ هەوڵی لێکۆڵینەوەی ئەو " زمانە سەرچاوەیەی پێشتر بەکارهێنراوە" بدرێت، بەبەکارهێنانی دەستکەوتی زمان‌و دیالێکتە زیندووەکان‌و بەپیشاندانی یادگارە نووسراوە کۆنەکان‌و خستنە کاری هەموو توانایەکی ڕاستی دارشتنەوە، بەبەرچاوەوە گرتنی بەخششە کانی بەرەوپێشچوونی گەشەسەندنی گەل، کەهەڵگری ئەم فاکتانەی زمانە.

ئەگەر لەتوانادانەبێت زمانی بناغە سەر لەنوێ بنیاتبنرێتەوە بەتەواوی، ئەوە لەتوانادا هەیە بینای گراماتیکی و فۆنەتیکیی دابمەزرێنرێتەوەو تارادەیەك بنەڕەتی سەرەکیی لێکسیکاشی.

پێوەندیی زمانناسیی سۆڤێتی لەگەڵ مێتۆدی بەراوردکاریی مێژوویی‌و پۆلینکردنی گینالۆگیی زمان وەك ئەنجامی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریی مێژوویی زمان چییە؟

١) خزمایەتیی گشتیی زمانان لەوەوە هەڵدەقوڵێ کەئەم زمانانە لەیەك زمانی بنەڕەتەوە سەریانهەڵداوە (یا لەیەك گرووپی زگماکەوە) بەرێگەی پەرش‌و بلاوبوونەوەوە بەهۆی پارچە پارچەبوونی کۆمەڵەی هەڵگرانی زمانەکەوە. بەڵام ئەمە پرۆسیسێکی درێژی ناکۆکەو ئەنجامی "یەك لق بوون بەدوو"ی ئەو زمانانە نییە، وەك ئا. شلێیهێر بیری کردۆتەوە. زیاد لەمە لێکۆڵینەوەی گەشەسەندنی مێژوویی ئەم زمان

یا گرووپی ئەو زمانانە هەر لەسەر بنەڕەتی ئەنجامی مێژوویی ئەو خەڵکانە دەبێت، کەهەڵگری ئەم زمانە یا ئەو دیالێکتەن.

٢) زمانی- بناغە هەر ئەوە نی‌یە بەگشتی "لەیەك دەچێت " (مێیە)بەڵام لەڕاستیدا بوونی مێژوویی ئەو زمانەی بەتەواوی دروست دەبێتەوە لەتوانادا نی‌یە، بەڵکو بەخششی فۆنەتیك، گراماتیك‌و لێکسیکا (کەمتر) لەتوانادایە دروست بێتەوە، ئەمەش بەگەشی لەبەخششی زمانی هیتیدا سەلمێنراوە کەلەتەتبیقی جەبریی دامەزراندنەوەی ف. دێ سۆسیوردا دیارە، بۆ شێوەی گشتیش دەبێ لەیەکچوون باری مۆدێلی داڕشتنەوە بپارێزرێت.

٣) لەکاتی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریی مێژوویی زماندا دەبێ چی وەك لەتوانادایەو دەبێ بەراورد بکرێت؟

ا) دەبێ بەراوردی ووشە بکرێت، بەڵام هەر ووشە ناو هەموو وشەیەك ناو بەپێی بەرێکەوت لەیەکچوونیان نا.

لەیەکچوونی ووشە لەزمانی جیاوازدا لەکاتی ئەم یا ئەو لەیەکچوونی دەنگ یا مانادا نابێ شتێك نەسەلمێنێت،هەروەك یەکەم، هەروەك ڕەنگە ئەمە پاشماوەی وەرگرتن بێت (بۆنموونە، بوونی وشەی فابریکا (رووسی —و-) لەوێنەی (   ) (فابریك) و ( ئەو چەشنانەدا لەزمانی جیاجیادا) یا ئەنجامی بەڕێکەوت لەیەکچوون (وەك، بەئینگلیزی‌و بەفارسیی نوێ هەر ئەو تێکەڵی‌یەی‌و وتنی بەد بەمانا (خراپ)، ئەمە بەلای کەمەوە ووشە فارسی‌یەکە هیچ شتێکی یەکگرتووی لەگەڵ ئینگلیزییەکەدا نی‌یە: ئەمە تەواو یاریی سروشتە. (بەگشتی سەیرکردنی لێکسیکای ئینگلیزی‌و لێکسیکای فارسیی نوێ نیشتمان دەدات، کەنابێ هیچ ئەنجامێك لەم فاکتەوە وەربگرین) ([١٤])

ب) لەوانەیەو دەبێ ووشە لەزمانە بەراوردکراوەکانەوە وەربگرین، بەڵام هەر ئەوانەی، کەلەڕووی مێژووییەوە ڕەنگە بچنەوە سەر چەرخی زمانی بناغە. بەم جۆرە

---

٢٥ ئا. مێیێ، سەرەتای لێکۆڵینەوەی بەراوردکارین زمانە هیند ئەورووپی‌یەکان، مۆسکۆ، ١٩٣٨، ل ٥٠

(تێبینی وەرگێڕ: دیارە مێیێ نەیزانیوە کەووشەی (بەد) هەر فارسی نییە، بەڵکو لەچەند زمانێکیتری ئێرانیدا هەیەو ئەمانەو زمانی ئینگلیزی هەر هیندۆ ئەورووپین ئەو لەیەکچوونە ڕێککەوت نییە.

دەبێو فەرز بکەین کەزمانی بناغە لەبینای هاوبەشی تیرەییدا هەیە، ئەوەش دیارە، کەووشەی دروستکراوی فابریکەی سەردەمی سەرمایەداری بۆ ئەوە دەست نادات، چ ووشەیەك بۆ ئەم چەشنە بەراوردکارییە دەست دەدات؟ پێش هەموو شت ناوی تیرەیی، ئەم ووشانە لەو سەردەمە کۆنەدا زۆرتر پێویست بوو بۆ دەستنیشانکردنی بینای کۆمەڵ، بەشێکی تا ئێستاش وەك رەگەزی بناغەی سەرەکیی فەرهەنگیی زمانە خزمەکان (دایك، برا، خوشك) هەندێکیتر.. لەکارپێکردندا نەماوە، ئەوەی بووە بەفەرهەنگی پاسیف "تەمەڵ، سلبی — و-" وەك "دێڤیر- شووبرا، سنۆخا، بووك-ژنی کورت، یاتری- هێومرژن(٢٥) بەلام بۆ لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری ئەم ووشەو ئەویش دەست دەدەن، بۆنموونە، یاتری، یایاترۆڤ، هێومرژن، وشەیەکە هاوشانی لەزمانی سلاڤیی کۆن، سیبیری، سلۆڤینی، چیکیوپۆلۆنیدا هەیە، لەوێدا کە(ietrew) و زووتر (ietry) دەنگداری لووت نیشاندەدات، کەئەم رەگە دەبەستێت بەوشەی (ympoba) ئوترۆبا) ناوسك، (Hympo) (نوترا)- سك ، (Bhymp) (فنووتر) ناوەوەو بەوشەی (entrilles) ی فەرەنسیو ئەم جۆرە.

ژمارەش (تا دە) و هەندێك راناوی بنەڕەتی، وشەی ناوی ئەندامەکانی لەش، پاش ئەوەش ناوی هەندێك ئاژەڵ، ڕووەك، چەك بەکاری بەراورددێن، بەلام لێرەدا ڕەنگە جیابوونەوەیەك لەنێوان زمانەکاندا هەبێت، ئەوەی وەك ئەوەی لەکاتی کۆچو تێکەڵبوون لەگەڵ گەلانیتردا ڕەنگە هەندێك وشە وونبنو هەندێکیتر ووشەی بێگانە جێگایان بگرێتەوە (بۆنموونە،

(لۆشاد، ئەسپ- لەجێی ( Kon) (کۆن) ئەسپ، (بۆ ئەسپو ماین بەکاردێن —و-)

سێیەم تەنیا وەرگرتنە.

ئەو خشتەیەی لەلاپەڕەی داهاتوودا دەبینرێت لەیەکچوونی لێکسیکیو فۆنەتیکی لەزمانە هیندۆ ئەوروپییەکاندا بەپێی ئەو ووشانە دەرخستووە کەکراون بەنموونە.

---

٢٦ رەنگە ئەم ووشانە ئێستا لەناو رووسدا زۆر بەکارنەیەن، بەلام لەووڵاتی وەك کوردستاندا هەر بەکاردێن، -وەرگێر-

٤) تەنیا یەکگرتنی ڕەگی ووشە یا تەنانەت ووشەش بەس نی‌یە بۆ ڕوونکردنەوەی خزمایەتیی زمان؛ وەك لەسەدەی ١٨هەمدا ڤ. جونز نووسیویەتی پێویستە یەکگرتن لەپێکهاتنی گراماتیکیی ووشەشدا بێت. قسەش هەر لەبارەی پێکهاتنی گراماتیکی‌یەوە دەکرێت، نەك لەبارەی بوونی ئەم یا ئەو جۆری گراماتیکی لەم زمان یا ئەو زماندا. بەم جۆرە،جۆری وێنەی فرمان لەزمانە سلاڤی‌یەکانو چەند زمانی ئەفەریقیادا دەرکەوتوون، بەڵام ئەمە بەشێوەی مەتریاڵ ( مانای هۆی گراماتیکیو پێکهاتنی دەنگ) تەواو جیاواز دەرکەوتوون. لەبەرئەوە لەسەر بناغەی ئەو یەکگرتنە لەنێوان ئەو زمانانەدا نابێ قسە لەخزمایەتیی بکرێت.

بەڵام ئەگەر ئم گرنگی‌یە گراماتیکی‌یە لەزمانانەدا ئەو یا ئەم ڕێگەو لەپێکهاتنی دەنگی لەیەکچوودا دەربخات، ئەوە لەهەموو شت زیاتر دەبێتە گەواهی خزمایەتیی ئەو زمانانە بۆ نموونە:

خشتە

| زمانی رووسی | زمانی رووسی کۆن | سانسکریت | زمانی یۆنانی-دۆریکی | زمانی لاتینی | زمانی گۆتی |
|---|---|---|---|---|---|
| (بیرووت)-دەبات | | bnaranti | pheronti | ferunt | Bairand |

لەوێدا کەهەر رەگ نا، بەڵکو گەردانی گراماتیکیش

(      ) بەتەواوی یەك لەگەڵ یەکتردا یەکدەگرنەوەو دەچنەوە سەر یەك سەرچاوەی گشتی.

گرنگیی پێوانەی لەیەکچوونی گراماتیکی لەوەدایە کەئەگەر لەوانە بێت ووشە وەربگیرێت (کەلەهەموو شت زیاترە) هەندێ جار مۆدیلی گراماتیکیی ووشە (کەپێوەندیی بەپاشگرێکی گەردانکردنی دەستنیشانکراوەوە هەیە)، ئەوە فۆرمی گەردانکردن وەك پێڕەو دەکرێت، لەوەرگرتن نایەت. لەبەر ئەوە لەیەکچوونی

بەراوردکاریی گەردانی حاڵەتو فرمانی-شەخسی لەهەموو شت راستتر دەگەنە سەر ئەنجامی پێویست.

٥) لەکاتی بەراوردی زماناندا پێکهاتنی دەنگی بەراوردکراوان رۆڵێکی ئێجگار بایەخدار دەبینێت. بێ فۆنەتیکی بەراوردکراو بەراوردکاریی زمانەوانی نابێت. هەروەك لەمەوبەر نیشاندرا، یەکگرتنی تەواوی دەنگ لەفۆرمی وشەی زمانانی جیاوازدا ناتوانێ نەهیچ پیشان بداتو نەهیچ بسەلمێنێت، بەپێچەوانەوە، یەکگرتنی بەش بەشی دەنگو جیابوونەوەی بەش بەش، بەمەرجی لەیەکچوونی رێکوپێکی دەنگ، رەنگە هەر پێوانەی بەتینە بۆ خزمایەتیی زمان. لەبەراوردکردنی فۆرمی لاتینی (5upym, ferunt) (بیرووت)ی رووسیدا لەیەکەم سەرنجدا زەحمەتە شتی گشتی بدۆزینەوە. بەڵام ئەگەر باوەڕمان هەبێت، کە ( ) (ب)ی سلاڤیی سەرەتایی لەلاتینیدا بەرە بەرە لەگەڵ ( f) یەکدەگرن (برات- فراتێر، بۆب- فابا، بێرووت- فێروونتو بەم چەشنە، ئەوا لەیەکچوونی دەنگی سەرەتای لاتینی (f) لەگەڵ (p (ب)ی سلاڤیدا ئاشکرا دەبێت. هەرچی فلێکیە، ئەوا لەسەرەوە پیشانماندا کەیکگرتنی)ی رووسی لەپێش ( p ی بزوێنی سلاڤیی کۆنو رووسی کۆندا (کە o ی لووتە) لەکاتی بوونیدا لەزمانە هیندۆ ئەوروپییەکانیتردا بەیەکەوە لکانیدەنگدار + بزوێنی لووت+ بزوێن (یا لەکۆتایی ووشەدا)، وەك ئەم لکاندنە لەم زمانانەدا، دەنگداری لووت نادات، بەڵکو لەوێنەی (unt,-ont (i), and)و ئەم چەشنانەدا دەپارێززرێ. دانانی لەیەکچوونی "دەنگ"ی رێکۆپێك یەکێکە لەبنەڕەتە بەراییەکانی میتۆدی بەراوردکاریی مێژوویی لێکۆڵینەوەی زمانە خزمەکان.

ب) هەرچی گرنگیی لەیەکچوونی وشەیە، ئەوەش مەرج نییە بەتەواوی یەکگرتووبن، بەڵکو دەتوانن بەپێی یاسای چەند مانایی لەیەکتر جیاببنەوە.

بەم جۆرە، لەزمانە سلاڤییەکاندا ( ) گۆرەد، گراد، گرۆد)و ئەم چەشنە. مانای "نوقتەی نیشتەجێ بوونی چینێکی دەستنیشانکراو"ە، بەڵام ( ) ئەو چەشنە (پێرێگ... هتد —و-) بەمانای "کەنار" بەڵام لەیەکچووی ئەوان لەزمانە خزمەکانیاندا Garten, Berg (لەئەلەمانیدا) مانای "باخ" و "چیا"یە. زەحمەت نییە بزانین وشەی وەك (gord) سەرەتا جێگەی دەوروەدراو" دوایی مانای "باخ" دەگرێتەوە،

هەرچــی (berg)ە، تــوانیی مانــای "کــەنار" بگرێتــەوە بەچــیاوەبێت یــا بــێ چــیا، بەپێچەوانەوە مانای هەر چیایەك بێت لـەلای ئـاو یـا بێئـاو. رووئـەدات کـەمانای ئـەو وشەیەش لەکاتی جیابوونـەوەی زمانەخزمەکانـدا ناگۆڕێـت (بـەراورد بکـە، (Jopoga) بەرۆدا، بەرەدا- ریش و لەیەکچووی ئەو لەئەڵەمانیـدا (Bart) ریـش یـا (20 Aoba) گۆلۆڤـا گۆڵـەڤا ی رووســی "ســەر"و لەیەکچـووی ئـەو لەلیتڤیـدا galva"سـەر"و لـەو چەشنە).

٧) لەکاتی دانانی لەیەکچوونەی دەنگدا پێویستە گۆڕینی مێـژوویی دەنـگ بەرچاوبگرین، ئەوەی بەهێزی ناوەوەی یاساکانی گەشەسـەندنی هـەر زمانـەدا لەکۆتاییـدا لەوێنـەی "یاسـاکانی فۆنەتیك" دا دەردەکەوێت (بڕوانە ف. بـ ٨٥)

بەم جۆرە، زۆر نزیکیـی یـەکگرتنی وشـەی (2 am 6) گـات- ی رووسـیو نـەرویجی gate"شــەقام" دەبیــنین. بــەڵام ئــەم لەیەکچــوونە هیچــمان ناداتــێ وەك ب. ئــا. ســیریبرینیکوڤ بەراســتی تێبینــی کــردووە، هــەروەها لەزمانــە گێرمانیيەکانیشــدا (کەنـەرویجیش لەوانـە) دابرینـی دەنگـی (b,d.g) نابـێ بەسـەرەتایی ئـەویش بـەهۆی بزوێنی گواستراوەوە، کەبریتیـیەلەو یاسا مێژوویەی فۆنەتیك کەهەیـە. بەپێچـەوانەوە، لەیەکەم سەرنجدا لەیەکچوونی گرانی وشـەی، وەك ( ) ژینـا، ژنـای رووسـی Konaی نــەرویجی ڕەنگــە بېرێتــەوە ســەر یــەکگرتوویی، ئەگــەر بــزانین لەزمانــە گیرمانـیيــە سکەندیناڤیيەکاندا (K) لە (g) ەوە هاتووە، بەڵام لە زمانە سلاڤیيەکاندا (g) لـەحاڵی پــێش دەنگــداری ڕیــزی ژنــای رووســی لەیــەك ووشــەوە هــاتوون؛ بــەراوردی ووشــەی (gyne)ی یۆنانی (ژن) بکە، لەوێدا بـزوێن نـەجووڵاوە، وەك زمانـە گێرمانیـیەکان، یـا وەك لەپێشـەوەدا گـۆڕاوە بـە (ژ) زیادلـەوە Kona ی نـەرویجیو "نـوتقی چـەناگە"ی (g) بە (ژ)ی پێش دەنگداری ریزی یەکەم نەبێ، کەلەزمانە سلاڤیيەکاندا هەیە.

ئەگـەر ئێمـە یاسـا فۆنەتیکیـیەکانی گەشەسـەندنی ئـەو زمانانـە بـزانین، ئـەوا ئـەو جۆرە لەیەکچوونەی وەك ( l ) ی رووسی و (iK)ی سکەندیناڤیيا (cmo-ستۆ: سەد)ی رووسی (hekaton)ی گریکی (نامانتۆقێنێت)

٨) چۆن سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی نموونەی کۆن دێتە کایەوە، یا روخساری پێشوو، لەکانی لێکۆلینەوەی بەراوردکاریی – مێژوویی زماناندا؟

بۆ ئەمە پێویستە:

ا) بەراوردی لەرەگەوەو رەگەزە ئافیکسییەکانی ووشە.

ب) بەراوردی بەخششی یادگارە نووسراوەکانی زمانە مردووەکان لەگەڵ بەخششی زمانو دیالێکتە زیندووەکاندا (ئامۆژگاریی ئا. خ. ڤۆستۆکۆڤ)

پ) بەرهەمهێنانی بەمیتۆد بەراوردی " جوغزە فراوانکراوەکان" واتە دەستپێکردن لەزمانە خزمە نزیکەکانەوە بۆ گرووپو خێزانە خزمەکان (بۆنموونە، بەراوردی رووسی لەگەڵ ئۆکراییینی، زمانە سلاڤییە رۆژهەلاتیی‌یەکان – لەگەڵ گرووپەکانیتری سلاڤی، سلاڤی‌یەکان- لەگەڵ بەلتیقی، بالتە- سلاڤی‌یەکان- لەگەڵ هیندۆ ئەورووپی‌یەکانیتر (ئامۆژگاریی ر. راسك)

ج) ئەگەر لەزمانە خزمە نزیکەکاندا لەیەکچوونی وابیینین، بۆنموونە وەك ( ) (گۆلۆڤا- سەر)ی رووسی، ( ) گلاڤا- سەر)ی بۆلگاری

( ) ی پۆلۆنی (کەرێکەوتی لەیەکچوونیتر دەسەلمێنێت، وەك

( ) (زۆلۆتە) ( ) زلاتە زێڕ- هەروەها (Boroha ) ڤۆرۆنۆ،

(Braha) ڤرانا) (Wrone ) (قەلەرەش)و لەیەکچوونی رێکوپێکیتر، ئەوا پرسیارێك دێتە پێشەوە:

ئایا وێنەی کۆنو رووخساری پێشوو (ئارخیتیپو پرافۆرم)ی ئەم وشانەی زمانە خزمەکان چۆن بوون؟

دوورنی‌یە هەرچۆنێك بێت لەو نموونانەوە بزانین، ئەم دیاردانە هاوتەریب بنو یەك لەیەکەوە نەهاتبن، کلیلی بڕیاردان لەسەر ئەم مەسەلەیە بەم جۆرەیە، یەکەم بەبەراورد لەگەڵ جوغزیتری زمانە خزمەکاندا، بۆنموونە لەگەڵ (golva)ی لیتیڤی (سەر" لەگەڵ (gold) (زێڕ"ی ئەلەمانی یا جارێکیتر لەگەڵ varna "قەل"ی لیتیڤیو دووەم. بەبینینی ئەم گۆڕینە دەنگی‌یانە (ئەنجامی گرووپی (tolt)و (tolt)

لەزمانە سلاڤییەکاندا) لەناو یاسایەکی زۆر گشتیتردا، لەم حاڵەشدا لەناو (یاسای کەرتی دەنگیی کراوە"دا ([16]) ئەوەی بەپێی ئەو لەزمانە سلاڤییەکاندا گرووپی دەنگی ( O, e)و پێش (i و v)و لەنێوان بزوێندا دەبێ.. "دەنگیی تەواو "بدەن(دوو دەنگدار لەدەوری (I) یا ( ) وەك لەرووسیدا هەیە)، یا مێتاتیزا.. "هەڵگێڕانەوە."ز (وەك لەپۆلۆنیدا هەیە) یا هەڵگێڕانەوە بەدرێژکردنەوەی دەنگدارەوە (otkyga ئۆتکودا- ، وەك لەبولگاریدا هەیە)

٩) لەکاتی لێکۆڵینەوەی مێژوویی- بەراوردکاریی زماندا دەبێ بەتایبەتی لەیەك وەرگرتن جیابکەینەوە لەلایەکەوە، ئەمە هیچ شتێك بەبەراوردکاری نابەخشێت (لەسەرەوە سەیری وشەی فابریکە بکە)؛ لەلایەکیترەوە- لەیەك وەرگرتن، لەبارەی پێکهاتنی فۆنەتیکیی نەگۆڕاودا لەو زمانەدا کەلەویتری وەرگرتووە، دەتوانێ وێنەی کۆن یا بەگشتی دیمەنی هەرەکۆنی ئەو ڕەگە یا ئەو ووشەیە بپارێزێ، هەروەك لەزمانە لێوەرگیراوەکەدا، ئەو چەشنە گۆڕینەوەی فۆنەتیك نەبووە، کەخۆی ئاساییە بۆزمان‌و وەرگرتنەکەش لەوێوە هاتووە، بەو جۆرە بۆنمونە، وشەی تەواو دەنگداری رووسی

(molokho ) تۆلۆکنۆ (ئاردی هەرزن) یا وشەیەك کەئەنجامی نەمانی تیپی دەنگیی لووتی تێدا دەردەکەوێت ( ) ىکودێل – کەتان) لەوێنەی کۆنی وەرگیراودا ( Kuontala, Talkkuna) یە لەزمانی فینلەندیدا، کەلەوێدا وێنەی ئەم ووشانە، زۆر نزیك لەوێنە کۆنەکەیەوە پارێزراوە، بەمەجەری (هەنگاری) "szalma" (هەنگاری) لەپێوەندیی زۆر کۆندا لەگەڵ سلاڤییە رۆژهەڵاتییەکاندا لەچەرخی پێش پەیدابوونی لێکدانی تەواو دەنگداردا لەزمانە سلاڤییە ڕۆژهەڵاتییەکاندا پیشان دەدات‌و دارشتنەوەی ووشەی رووسی (coloma) (سۆلۆما-کا) لەوێنەی سلاڤیی گشتیی (solam)دا دەسەلێنێت.

١٠) بێ میتۆدی ڕاستی داڕشتنەوە ناتوانین ئەتیمۆلۆژیای تەواو بێنینە کایەوە. لەبارەی زەحمەتییەکانی دامەزراندنی ئەتیمۆلۆژیای ڕاستەوەو لەبارەی ڕۆڵی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریی- مێژووییەوەو لەبارەی دارشتنەوەوە، بەتایبەتی لەلێکۆلینەوەی ئەتیمۆلۆژیدا، بڕوانە

٢٧ لەم بارەیەوە سەیری ف ٧، بەشی ١٥ بکە.

لێکۆڵینەوەی ئەتیمۆلۆژیی ووشەی (        ) (پشێنۆ- بروێشی هەرزن) لەکۆرسی" سەرەتای زمانناسی" ل.ئا. بۆلاخۆڤسکیدا (١٩٥٣، ل٦٩)

لەئەنجامی نزیکەی دووسەد ساڵی لێکۆڵینەوەی زماندا میتۆدی بەراوردکاریی — مێژوویی زمانناسی بەکورتکراوەیی لەپۆلینکردنی گینیالۆگیی زماندا دەردەکەوێت.

لەسەرەوە باسی چوون یەك نەبوونی زانین لەبارەی زمانی خێزانی جیاجیاوەکرا. لەبەرئەوە یەك خێزان، کەزۆرتر لێی کۆڵراوەتەوە. زۆر بەووردی پیشانداروە، خێزانێکیتر کەمتر ناسراوە، بەوێنەیەکی ناکۆکی ووشك پێشەشکراوە.

خێزانەکانی زمان دەبن بەچەند گرووپ، بەشە گروپی زمانی خزمیيەك. لەهەر پلەیەکی پەرش بووندا زمانی هەرە نزیك بەبەراورد لەگەڵ زمانەکانی پێشووی، زۆر گشتیدا یەکدەگرن.

بەم جۆرە زمانە سلاڤیيە رۆژهەڵاتیيەکان نزیکیيەکی زۆریان تێدا دیارترە، لەهەموو سلاڤیيەکاندا بەگشتی هەر سلاڤیش لەیەك نزیکترن وەك لەهیندۆ ئەوروپی.

لەکاتی ژماردنی زماناندا لەسنووری گرووپو ژماردنی گرووپدا لەسنووری خێزاندا لەسەرەتادا  زمانە زیندووەکان دەژمێردرێن، پاشان مردووەکانیش.

ژماردنی زمانەکان دەبێ بەلای کەمەوە لێکدانەوەی جوگرافی، مێژوویيو فیلۆلۆژیی لەگەڵدابێت.

## ٧٨. پۆلینکردنی گینیالۆگیی زمانان

١. زمانە هیندۆ ئەوروپيیەکان

١. گرووپی هیندی ([٢٨])

(بەگشتی لە٩٦ زمانی زیندوو زیاترە)

١)هیندیو ئۆردوو (هێندێکجار بەنا گشتیی هیندوستانیيەوە ([٢٩]) یەکدەگرێت_ دوو دیمەنی جیاوازی یەك

[٢٨] لەبارەی زمانەهیندیيەکانەوە بڕوانە:گ٠ئا٠زگراف ،زمانەکانی هیندستان،پاکستان، سیلانونیپاڵ/مۆسکۆ ،١٩٦٠

زمانی ئەدەبیی نوێی هیندی؛ ئۆردوو- زمانی دەوڵەتیی پاکستانە، نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی عەرەبی هەیە؛ هیندی (زمانی دەوڵەتیی هیندستانە) — لەسەر بناغەی نامە هیندیە کۆنەکانی دیڤانەگار دەنووسرێ.

٢) بنگالی.

٣) پەنجابی

٤) لاخندا

٥) سیندخی

٦) راجاستخانی.

٧) گوجاراتی.

٨)ماراتخی

٩) سینگالی

١٠) نیپالی (پاخاریی ڕۆژهەلات) لەنیپال.

١١) بیخاری.

١٢) ئۆریا (بەجۆریتر : ئۆردی، ئوتکالی، لەڕۆژهەلاتی هیندستان)

١٣) ئاسسامی.

١٤) کشمیری.

١٥) قەرەجی، لەئەنجامی راگوێزان و کۆچکردنی سەدەکانی ٥-١٠ی زاینی پەیدابووە

## زمانە مردووەکان:

١٦) سانسکریت. ڤێدیی- زمانی کتێبی پیرۆزی هەرەکۆنی هیندیەکان — ڤیدا، کەلەنیوەی یەکەمی هەزاری دووەمی پێش زاییندا بەکارهاتووە (درەنگتر تۆمارکراوە) . زمانی ئەدەبیی "کلاسیکی" ی کۆنی هیندیەکان لەسەدەی ٣هەمی پێش زاینەوە تا سەدەی ٧هەمی

[٢٩] بڕوانە،بۆ نموونە،ناونیشانی کتێبی ئا٠پ ٠بارانیکۆف"هیندستانی(ئۆردە لە هیندستان) ، لینینگراد ١٩٣٤،

زایین (مانای حەرفیی سانسکریت (samskrta)" قاڵ کراوە"، بەرامبەر بە(prakrta)" ڕێکنەخراو، زمانی قسەکردن)؛ لەسانسکریتەوە ئەدەبیاتێکی دەوڵەمەندی، ئاینیو پیرۆز ماوەتەوە (ئیپۆس، دراما) یەکەم گراماتیکی سانسکریت سەدەی ٤ هەمی پێش زایین پانینی، پوختەکراوی سەدەی ١٣هەمی ز ڤۆپادیڤی،

١٧) پالی- زمانی ئەدەبیو ڕووناکبیریی هیندیی ناوەراست لەسەدەکانی ناوەڕاستدا

١٨) پراکریتی- شێوەی قسەکردنی جیاوازی هیندیی ناوەراست، کەزمانی هیندیی نوێ لەوەوە هاتووە؛ وەڵامی کەسی پلەی دووەم لەدرامای سانسکریتیدا بەپراکریتی نووسراوە

٢. گرووپی ئێرانی ([30])

(لە١٠ زمان زیاترە؛ نزیکییەکی زۆر لەگەڵ گرووپی هیندیدا دەبینرێت، کەلەگرووپی هیندۆ ئێرانی، یائاریدا یەکدەگرن؛ ئاریا — ناوی خۆیی تیرەییە لەیادگارە کۆنەکاندا، لەوێوە ئێرانو ئالان — بووە بەناوی خۆیی سکیفەکان).

١. فارسی- نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی عەرەبییە؛ لەبارەی فارسیی کۆنو فارسیی ناوەراستەوە سەیری خوارەوە بکە.

٢. پاشتۆ (پوشتو، ئەفغانی) زمانی ئەدەبییە، لەساڵانی ٣٠ەوە زمانی دەوڵەتیی ئەفغانستانە.

٣. بلووچی (بۆلۆچۆ، بێلووجی)

٤. تاجیکی

٥، کوردی

٦. ئۆسیتینی؛ شێوەی ئیرۆنی (ڕۆژهەڵاتی)و دیگۆری (ڕۆژئاوایی) ئۆسیتینی- پاشماوەی ئالان — سکیفن.

٧. تاتی — تات دەبن بەدوو بەشەوە : تاتی موسوڵمانو (جوولەکەی چیایی)

٨. تاڵشی

---

[30] لەبارەیزمانەئێرانییەکانەوە بڕوانە:م٠ئۆرانی،زمانەئێرانییەکان ،مۆسکۆ، ١٩٦٣ ٠

٩. کەنار قەزوێنی (دیالێکتەکانی گێلانی، مازندەرانی)

١٠. زمانە پامیریەکان (شوگنانی، روشانی، بارتانگی، ساریکۆلیی، یازگولامی، ئیشکاشیمی، ڤوخانی) زمانانی بێنووسینی پامیر.

١١. یاگنۆبی

**زمانە مردووەکان:**

١٢. زمانی فارسیی کۆن- تەختە نووسراوە بسمارییەکانی سەردەمی ئاخمینییەکان (ئاریا، کسێرکساو ئەوانیتر) سەدەکانی ٦-٤ی پێش زاین.

١٣. ئاڤێستایی – زمانێکیتری کۆنی ئێرانییە، لەکتێبی پیرۆزی فارسیی ناوەڕاست "ئاڤێستا"دا بەکارهاتووە، کەلەوێدا تێکستی ئایینی پەرستنی زەردەشتییەکانی تێدا کۆکراوەتەوە، ئەوانەی پێڕەوی زەردەشت دەکەن (بەگریکی: زۆرۆاسترا).

١٤. پەهلەوی – فارسیی ناوەڕاست سەدەکانی ٣-٩ی زایین، لەوەرگێڕانی "ئاڤێستا"دا پارێزراون. (ئەم وەرگێڕانە "زەند"ی پێدەڵێن. هەر لەبەرئەوەیە زەمانێکی زۆر بەهەڵە بەزمانی ئاڤێستایی خۆی دەوترا زەندی).

١٥. میدی- جۆرێکە لەدیالێکتە ئێرانییەکانی باکووری –خۆرئاوا؛ یادگاری نووسراوی نەماوە.

١٦. پارفیانی – یەکێکە لەزمانە فارسییەکانی ناوەراست لەسەدەی ٣ی پێش زاییینیدا- ٣ی زایین، لەپارڤ لەباشووری خۆرهەڵات تا زەریای قەزوین بڵاوبۆتەوە.

١٧. سۆگدێی – زمانی سۆگدیانیی دۆڵی زەرێڤشانە، لەهەزار ساڵەی یەکەمی زاییینیدا، باپیری زمانی یاگنۆبییە.

١٨. خوارەزمی- زمانی خوارەزمی لەخوارووی رۆخانەی جەیحون (ئەموداری)دا – سەرەتای هەزار ساڵەی دووەمی زایین.

١٩. سکێفی- زمانی سکێفەکان (ئالان)ەکانە، کەلەو دەشتانەی باکووری کەناری دەریای ڕەشداو لەخۆرهەڵات تا سنووری چین لەهەزاری یەکەم بۆ هەزاری دووەمی

زایین دەژیان؛ لەو ناوە تایبەتی‌یانەا ماوەتەوە کەلەگریکییەوە گواستراوەتەوە؛ باپیری زمانی ئۆسێتینی‌یە.

۲۰. ساکی (خاتانی) لەئاسیای ناوەڕاستولەتورکستانی چینی؛ لەسەدەکانی ۵-۱۰ی زایین، تێکستی لەناو ئەو نامە هیندی‌یەکانی براهمادا ماوە.

تێبینی. زۆربەی ئێرانستە هاوچەرخەکان زمانە ئێرانی‌یە زیندوو و مردووەکان بەسەر ئەم گرووپانەدا دابەش دەکەن.

**ا- خۆرئاوایی‌یەکان :**

۱. باشووری خۆرئاوایی: فارسیی کۆن ناوەڕاست، فارسیی هاوچەرخ، تاجیکی([۳۱])، تاتی‌و هەندێکیتر

۲. باکووری- خۆرئاوایی: میدی، پارفیانی، بیلۆجی (بالوچی)، کوردی، تالشی‌و زمانەکانیتری دەوری قەزوین.

**ب. رۆژهەلاتی یەکان**

۱. باشووری — رۆژهەلاتی: ساکی (خاتانی)، ئەفغانی (پاشتۆیا پوشتو)، پامیری.

۲. باکووری — رۆژهەلاتی: سکیفی، سۆگدی، خوارەزمی، ئۆسێتینی، یاگنووبی.

۳. گرووپی سلاڤی.

ا. لقە گروپی خۆرهەلات.

۱. ڕووسی؛ شێوەی: باکوریی رووسی (گەورە) (O-ئۆ)یی باشووریی ڕووسی (گەورە) (ئا-A) یی؛ زمانانی ئەدەبیی رووسی کەلەسەر زەمینەی بەشە دیالێکتەکانی گواستنەوەی مۆسکۆو دەوروبەریدا بەکاردێت، لەو شوێنەی لەباشوورو باشووری خۆرهەلات دیالێکتەکانی توولی، کووری، ئۆرلۆڤی‌و ریازانی سیمای بەشە شێوە بێگانەکانی باکوور بلاوبۆتەوە، بناغەی دیالێکتەکانی پێشووی بەشە شێوەی مۆسکۆ کەهەندێك خاسیەتی ئەم دواییەی لاداوە، هەروەها لەرێگەی هەلمژینی رەگەزەکانی

[۳۱] باشوری–خۆرئاوایی :فارسیی کۆنو ناوڕاست،فارسیی هاوچەرخ ٠

زمانی ئەدەبیی سلاڤیی کلێسەوە، زیاد لەمە، لەزمانی ئەدەبیی رووسیدا لەسەدەی ١٦-١٨دا رەگەزی جیای زمانی بێگانە هاتە ناوەوە؛ کەنووسینیان لەسەر بناغەی ئەلف‌و بێی رووسی بوو، ئەو ئەلفو بێ یەی لەسلاڤی‌یەوە –کریلی‌یەوە هاتبووو لەزەمانی پەترۆسی یەکەمدا پوختەکرابوو؛ کۆنترین یادگاری لەسەدەی ١١ هەمدا بووە (ئەمە پێوەندیی بەزمانی ئۆکراینی‌و بێلورووسیشەوە هەیە) هەروەها زمانی رووسی زمانی نێونەتەوەیی کۆمەڵی گەلانی یەکێتیی سۆڤیەتە یەکێکە لەزمانە هەرە گرنگەکانی جیهان.

٢. ئۆکراینی (یائۆکرانی)؛ پێش شۆرش (ئۆکتۆبەری ١٩١٧و-) رووسی بچووك بوو؛ هەندێ جار لەسنووری رووسینی یا رووتێنیدایە؛ دوو شێوەی سەرەکیی هەیە: کەناری چەپی‌و کەناری راستی (بەنیسبەت رووباری دنێپەر)ەوە؛ زمانی ئەدەبی لەچەرخەکانی ١٦-١٧ی زاینیدا لەسەر بناغەی دیالێکتی تاڤیی – کێڤی بەکارهاتووە؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی رووسی‌یە.

### ب. بەشە گرووپی باشوور.

٤. بۆلگاری- بەرێگەی تێکەڵکردنی دیالێکتە سلاڤی‌یەکان لەگەڵ زمانی بولگارەکامی‌یەکاندا دامەزراوە، ناوەکەشی هەر لەوێوە هاتووەو، نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی رووسی‌یە؛ کۆنترین ئاساری سەر بەسەدەکانی ٧-٩ی زایینە.

٥. مەکدۆنی

٦. سیربەکرواتی؛ نووسین لای سیرب لەسەر بناغەی ئەلفو بێی رووسی‌یە، لای کروات لەسەر بناغەی لاتینی‌یە، کۆنترین یادگاری (ئاساری) سەر بەسەدەی ١١هەمی زایینی‌یە.

٧. سلۆڤێنی (یاسلۆڤینی)؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی لاتینی‌یە؛ کۆنترین یادگاری سەر بەسەدەی ١٠-١١هەمی زاینی‌یە

زمانە مردووەکان

٨. سلاڤیی کۆن (سلاڤیی کۆنی کڵێسە) – زمانیئەدەبیی گشتیی سلاڤییەکان. سەر بەسەردەمی سەدەکانی ناوەراستە، لەسەر بناغەی بەشە شێوەی سۆلوونیی زمانی کۆنی بولگاری پەیدابووە، ئەمەش بەستراوە بەسەرەتای نووسینی سلاڤی یان (دوو ئەلفو بێ؛ هلاهولیستا- ئەلفو بێی سلاڤی کۆن- کیریلی) و وەرگێڕانی کتیبەکانی کڵێسە کە بۆ پروپاگەندەکانی مەسیحییەکان لەناو سلاڤییەکانی سەدەکانی ٩-١٠هەمی زاینیدا، لای سلاڤییە رۆژئاواییەکان لاتینی بەهۆی کارتێکردنی بەرەو کاسۆلیکیزم چوونەوە لادراوە؛ لەوێنەی کڵێسەی سلاڤییەوە رەگەزی زمانی ئەدەبیی رووسیی چووەتە ناوەوە.

## پ. بەشە گرووپی رۆژئاوا

٩.چیکی؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی لاتینییە؛ کۆنترین یادگاری ئەوەی سەدەی ١٣هەمە.

١٠. سلۆڤاکی؛ نووسیی لەسەر بناغەی ئەلفوبێی لاتینییە.

١١. پۆلۆنی؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی لاتینییە؛ کۆنترین یادگاری سەر بەسەدەی ١٤هەمە.

١٢. کاشووبی

١٣. سێربۆلۆژیی (لەسنووری: سۆرابی، ڤێندیی دایە؛ دوو شێوەیە: لۆژیی سەروو (یا رۆژهەڵاتی) و لۆژیی خواروو (یاخۆرئاوایی)؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفوبێی لاتینییە.

زمانە مردووەکان:

١٤. پۆلابی- لەسەدەی ١٨هەمدا لەناوچووە، لەهەردوو کەناری رووباری لابی (ئیلبی)دا لەئەڵمانیا بلاوبوو.

١٥. دیالێکتەکانی دەوری زەریا- لەسەدەکانی ناوەراستدا بەهۆی زمان بەستنەوە (قەدەغەکردن) ی بەزۆرەوە مردوون؛ بەکەناری خوارووی زەریای بەلتیقدا لەکەنار دەریای پۆمۆری (پۆمێرانیا) دا بلاوبوونەتەوە.

٤. گرووپی بەلتیقی

١. ليتۆڤي؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی لاتینی‌یە، یادگارەکانی سەر بەسەدەی ١٤هەمن.

٢. لاتیشی؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی لاتینی‌یە؛ یادگارەکانی سەر بەسەدەی ١٥هەمن

٣. لاتگالی [٣٢]

## زمانە مردووەکان

٤. پرووسی – لەسەدەی ١٧هەمدا بەهۆی زمان بەستنەوە مردووە؛ نیشتمانەکەی رۆژهەڵاتی پرووسیی پێشوو بوو؛ یادگارەکانی سەر بەسەدەکانی ١٤-١٧هەمن.

٥. گرووپی گێرمانی

ئا. گێرمانیی باکوور، بەشەگرووپی (سکاندیناڤی).

١. دانیمارکی، نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی لاتینی‌یە؛ بەزمانی ئەدەبی لەنەرویجیشدا تاکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بەکارهاتووە.

٢. سویدی؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفوبێی لاتینی‌یە.

٣. نەرویجی؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفوبێی لاتینی‌یە، سەرەتا دانیمارکی بوو، بەو جۆرە زمانی ئەدەبی نەرویجیش تاکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم زمانی دانیمارکی بووە. لەنەرویجی ئێستادا دوو فۆرمی زمانی ئەدەبی هەیە: ریکسمۆل (بەجۆرێکیتر – بووکمۆل) کتیبی؛ زۆرنزیکترە لەدانیمارکی‌یەوە، لانسمۆل (بەجۆرێکیتر – نیونۆرسك)؛ زۆر نزیکترە لەدیالێکتە نەرویجی‌یەکانەوە.

٤. ئیسلاندی؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی لاتینی‌یە. یادگارە نووسراوەکانی سەر بەسەدەی ١٣هەمن (ساگی)

٥. فارِ رێری

ب. بەشە گرووپی گێرمانیی خۆرئاوا

---

[٣٢] ڕای واهەیە کە ئەمە هەردیالێکتی زمانی لاتیشی‌یە٠

٦. ئینگلیزی: زمانی ئەدەبیی ئینگلیزی لەسەدەی ١٦هەمدا لەسەر بناغەی دیالێکتی لەندەن سەدەکانی ١١-١٦ هەم – ئینگلیزی کۆن (یا ئەنگلۆسەکسۆنی، سەدەکانی ١١-١٦هەم، ئینگلیزی ناوەڕاستو لەسەدەی ١٦هەمەوە ئینگلیزیی نوێ بەکارهاتووە؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی لاتینییە (بێگۆڕین) یادگارە نووسراوەکانی لەسەدەی حەوت هەمەوەن؛ زمانێکە گرنگیی جیهانیی هەیە.

٧. هۆڵەندی لەگەڵ فلاماندیدا؛ نووسینی لەسەر بناغەی لاتینییە، لەیەکێتی باشووری ئەفەریقا بووری هەن، لەهۆڵەندەوە گواستراونەتەوە، کەبەجۆری جیاوازی زمانی هۆڵەندی دەدوێن، بەزمانی بووری (وەك : بەئەفریکانس)

٨. فریزی؛ یادگارەکانی سەر بەسەدەی چواردەهەمە.

٩. ئەلەمانی (نێمتسی —و-؛ دوو شێوەیە: ئەڵەمانیی خواروو (Niederdetscn) ی باکووری یا (plattdevtsch) و ئەڵەمانیی ژووروو Hochdeutsch ی خواروو)؛ زمانی ئەدەبیی لەسەر بناغەی بەشە شێوە ئەلەمانییەکانی خواروو بەکارهێنراوە، بەلام بەشەقلی زۆری باکورییەوە (بەتایبەتی لەتەلەفوزدا) ؛ کەچی هێشتا یەکگرتوویی دیار نییە؛ لەسەدەکانی ٨-١١ ئەلەمانیی ژوورووی کۆن؛ لەسەدەکانی ١٢-١٥هەم ئەلەمانیی ژووروی ناوەڕاست، لەسەدەی ١٦هەمەوە ئەڵەمانی ژووروی نوێ، سەر لەنوێ لەڕاوێژگاساکسۆنییەکانو وەرگێڕانەکانی لۆسەرو لایەنگرەکانییەوە کاری تێدا کرا؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلفو بێی لاتینییە بەدوو وێنەی جیاواز؛ گۆتیو ئەنتیکڤا، یەکێکە لە زمانە گەورەکانی جیهان.

١٠. ئیدیش (یا ئیدیش، جوولەکانەی نوێ) دیالێکتی ئەڵەمانیای ژووروی جیاجیا، لەگەڵ رەگەزی جوولەکانەی کۆن، لەگەڵ سلاڤیو زمانیتردا تێکەڵبووە.

پ. بەشە گرووپی گێرمانیی خۆرهەلاتی.

مردووەکان:

١١. ڤێستگۆتی (گـۆتیی خۆرئـاوایی —و-) زمـانی سـەدەکانی ناوەڕاستی دەوڵـەتی گۆتیـیـە لەئیسپانیاو ژووورووی ئیتاڵیا؛ نووسینی لەسـەر بناغـەی ئـەلفـو بێـی گـۆتی هـەبوو، کەلەلایـەن ئوسقوف ڤولفیلاوە لەسـەدەی چوارەمدا دانـراوە بۆئـەوەی ئینجیلـی پـێ وەرگێڕرێـت، کەهـەرە یادگاری کۆنی زمانە گێرمانییەکانە.

١٢. ئۆسـتگۆتی (گۆسـتیی خۆرهـەڵات —و) زمـانی گۆتیـیـەکانی رۆژهەڵاتـە، کەلەسەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا لەکەنار زەریای ڕەش‌و پۆدنـێ پروڤێـی خـواروو تـا سـەدەی ١٦هـەم لـەقرم ژیـاون. بـەهۆی ئـەوەوە کەفەرهـەنگێکی بچـووك، کەگەڕیـدەی هۆڵەندی بوسبێك داینابوو پارێزرابوو ئەم زمانە مابوو.

٦. گرووپی رۆمانی

(تاڕووخانـدنی ئیمپراتۆریـەتی رۆمـاو دروسـتبوونی زمانـە رۆمانییـەکان [٣٣] ئیتاڵییەکان)

١. فەرەنسی: زمـانی ئـەدەبی لەسـەدەی ١٦هەمـدا [١٧] لەسـەر بناغـەی دیـالێکتی ئیـل دێ فـرانس لەناوەنـدی پاریسـەوە دروسـتبوو، دیالێکتـە فەرەنسیەکان لەسـەرەتادا لەسـەدەکانی ناوەڕاسـتدا لەئـەنجامی تێکـەڵکردنی لاتینیـیـە میللیـیـە (بـازاڕی)یەکـەی رۆماییـیـەی داگیرکـەرەکان‌و زمـانی گالـە داگیرکراوەکـان کەدانیشـتووی ئەسـڵی بـوون — گـالی دروسـتبووە، نووسـینی لەسـەر بناغـەی ئـەلفـو بێـی لاتینیـیـە، هـەروەها یادگـاری کـۆنی لەسـەدەی ٩ی زاینیەوەیە.

٢. پرۆڤانسالی؛ زمانی نەتەوەی کەمی باشووری-رۆژهـەڵاتی فەرەنسە (پرۆڤـانس)ە؛ لەسەدەکانی ناوەڕاستدا زمانی ئەدەبی بووە (لیریکی ترۆبادۆر)و تاسەدەی ١٩هەم مابوو،

٣. ئیتاڵی ؛ زمانی ئەدەبیی لەسەر زەویی دیالێکتە تۆسکانییەکان، بەتایبەتی بەشـە شـێوەی فلۆرەنسـە دروسـتبووە، کەبـەهۆی تێکـەڵکردنی لاتینیـی میللـی لەگـەڵ زمـانی

[٣٣] ناوی (ڕۆمانی)لەوشەیڕۆماوەهاتووە ،کەناوی ڕۆمای لاتینییە ،ئێستا ئیتاڵیی پێدەڵێن

[٣٤]بڕوانە، ف ٧، ب ٨٩- لەبارەی دروستبوونی زمانی نەتەوەییەوە.

دانیشتوانی تێکەڵی سەدەکانی ناوەراستی ئیتاڵیادا پەیدابوو، نووسیی لەسەر بناغەی ئەلف‌و بێی لاتینی‌یە، لەرووی مێژووەوە یەکەم زمانی نەتەوەییە لەئەوروپادا

٤. ساردینی (یا ساردی)

٥. ئیسپانی؛ لەئەوروپادا لەئەنجامی تێکەڵبوونی لاتینی میللی (بازاڕی) لەگەڵ زمانەکانی دانیشتووە ئەسڵی‌یەکانی هەرێمی ئیبرایای رۆماییدا دروستبووە، نووسینی لەسەر بناغەی ئەلف‌و بێی لاتینی‌یە (ئەشچێتەوە سەر کەتالۆنی و پورتوگالی)

٦. کاتالۆنی.

٧. پورتوگالی.

٨. رۆمانی؛ لەئەنجامی تێکەڵبوونی لاتینیی میللی )(بازاڕی) لەگەڵ زمانی دانیشتووە ئەسڵی‌یەکانی هەرێمی داکیی رۆماییدا دروستبووە؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلف‌و بێی لاتینی‌یە

٩. مۆڵداڤی _(جۆرێکە لەرۆمانی)؛ نووسینی لەسەر بناغەی ئەلف‌و بێی رووسی‌یە.

١٠. رۆمانیی- مەکدۆنی (ئارۆموونی)

١١. رێتو- رۆمانی- زمانی نەتەوەیەکی کەمە، لەساڵی ١٩٣٨ەوە وەك یەکێك لەچوار زمانی دەوڵەتیی سویسرە دانی پێدانراوە.

١٢. کریۆلی- تێکەڵبووی فەرەنسی‌یە لەگەڵ زمانی خۆجێی دوورگەی هایتی‌دا.

**مردووەکان (ئیتاڵی‌یەکان)**

١٣. لاتینی – زمانی ئەدەبیی دەوڵەتیی رۆمابوو لەچەرخی کۆماری‌و ئیمپراتۆرییدا( سەدەی سێیەمی پ ز – سەدەی یەکەمی سەدەکانی ناوەراست)، زمانی یادگاری ئەدەبیی دەوڵەمەندە، لەداستان، لیریك‌و دراما، پەخشانی مێژوویی، بەڵگەی یاسایی‌و هونەری خوتبەدان؛ کۆنترین یادگاری سەر بەسەدەی شەشەمی پێش ز، یەکەم وەسفی زمانی لاتینی لای ڤارۆن، سەدەی یەکەمی پ ز، گراماتیکی کلاسیکیی دونات- سەدەی

چوارەمی زایین، زمانی ئەدەبیی ئەورووپای رۆژئاوا لەسەدەکانی ناوەراستداو زمانی کلێسەی کاسۆلیکی، لەپاڵ گریکیی کۆندا، سەرچاوەی ئیستیلاحاتی نێونەتەوەییە.

١٤. لاتینیی میللی سەدەکانی ناوەڕاست-بەشە دیالێکتیی لاتینیی میللی سەدەکانی ناوەراست کەلەگەڵ زمانی دانیشتووانی هەرێمی رۆما تێکەڵکراوە، ئیبری، داکیو.. هتد. زمانەرۆمانییەکانی لێ بۆتەوە: فەرەنسی، ئیسپانی، پورتوگالی، رۆمانی .. هتد.

١٥، ئۆسکی، ئومبری، سابێلیو بەشە شیوەی ئیتالییەکانیتر لەپارچە نووسراوە پەراگەندەی یادگارەکانی سەدەکانی دوایی پێش زایندا پارێزراون

٧. گرووپی کێلی

ئا. بەشە گرووپی گایلی

١. ئیرلەندی (ئیری)؛ یادگارە نووسراوەکانی لەسەدەی ٤هەمیی زاینیەوەیە (نامەی ئۆگامی) و لەسەدەی ٧ی زاینیەوە (لەسەر بناغەی لاتینی)؛ ئێستاش بەزمانی ئەدەبی دەزانرێت.

٢. سکۆتلاندی.

٣. زمانی دۆرگەی مان (لەزەریای ئیرلەندە)؛ مردووەو هەر لای ماسیگرە کۆنەکان پارێزراوە.

ب. بەشە گرووپی بەریتی.

٤. بریتۆنی، بریتۆنەکان (لەرابردوودا بریت) پاش گواستنەوەی ئەنگلۆ سەکسۆنەکان لەدۆرگەی بەریتانییەوە بۆ قارەی ئەورووپا کۆچیانکرد.

٥. ئوییلزی (یا ڤالليی)

**مردووەکان:**

٦. کۆرنوئولی؛ کۆرنول – نیوە دورگەی خوراووی خۆرئاوای ئینگلتەرە.

ب. بەشە شێوەی گالی

٧. گالی؛ لەچەرخی پەیدابوونی زمانی فەرەنسیدا مردووە. لەگالیا، باکووری ئیتالیا، لەبەلقان و تەنانەت ئاسیای بچووکیشدا بڵاوبووە.

٨. بەشەگرووپی گریکی

١. گریکیی نوێ، لەسەدەی ١٢هەمەوە.

**مردووەکان:**

٢. گریکی کۆن، سەدەی دەیەمی پێش زایین ٥هەمی زایین؛ دیالێکتە ئیۆنی‌یە ئاتی‌یەکان لەسەدەی ٧-٦ی پێش زاینیەوە؛ دیالێکتە ئاخێی (ئەرکادۆ قوبرسیی)یەکان لەسەدەی (٥)هەمی پێش ز، دیالێکتە باکووری – رۆژهەڵاتی‌یەکان (بێوتیی، فێساليی، لێسیۆسی، ئیۆلیی) لەسەدەی ٧هەمی پێش زوە، دیالێکتە رۆژئاواییەکان (دۆریی، ئیپیری، کریتی)؛ کۆنترین یادگاری لەسەدەی ٩هەمی پێش زوەیە. شیعری هۆمیرۆس، ئیپیگرافیکا([٨]) لەسەدەی ٤هەمی‌پێش زاینیەوە. زمانێکی ئەدەبیی گشتی‌یە لەسەر بناغەی دیالێکتی کۆن دامەزراوە کە مەرکەزەکەی ئاسینا بووە. زمانی یادگاری ئەدەبیی دەوڵەمەندە، لە داستان لیریك، دراما، فەلسەفە و پەخشانی مێژوویی لەسەدەکانی ٣-٢ پێش زاینیەوە. کارەکانی فیلیلوژەکانی ئەسکەندەریە، لە پاڵ سەرچاوەی ئیستیلاحە لاتینی‌یەکاندا

٣- گریکیی ناوەڕاست، یا بیزەنتی، زمانی ئەدەبیی دەوڵەتی بیزەنتەبووە لە سەدەکانی سەرەتای زاینەوە تا سەدەی ١٥هەم. زمانی یادگاری- مێژوویی، ئاینی و هونەری‌بووە.

٩- گرووپی ئەلبانی

ئەلبانی، یادگارە نووسراوەکانی لەسەر بناغەی ئەلف و بێی لاتینی‌یە.

١٠- گرووپی ئەرمەنی

---

[٢٥] بروانە، ف ٧، ب ٨٩ لەبارەی دروستبوونی زمانی نەتەوەیی‌یەوە.

ئەرمــەنی، زمانێکیئەدەبیـیــە لــە ســەدەی پێنجــەمی زایینــەوە، چــەند ڕەگــەزێکی تێدایە کە لە زمانە قەفقاسییەکانەوە سەریان هەڵداوە. زمانی کۆنی ئەرمەنی –گرابار- بە تەواوی لە زمانی زیندووی هاوچەرخەوە ئاشخارابار جیاوازە.

١١- گرووپە ئەناقۆڵییەکان

**مردووەکان:**

١. هێتییەکان(هێتتی – نێسێتی. بە نووسینی بسماری ناسراوە، هێتتی ناسراوە بە یادگارە هیرۆگلیفییەکان). زمانی دەوڵەتی هێتتی لە ئاسیای بچووك لە سەدەکانی ١٩-١٢ ی پێش زایین

٢. لوڤییی
٣. پالآیی
٤. کارییی

(٢-٤) لە ئاسیای بچووك لەو چەرخەدا.

٥. لیدیی
٦. لیکیی

(٥-٦) زمانە ئەنەتۆڵییەکانی چەرخی کۆن

١٢. گرووپی تۆخاری

**مردووەکان:**

١. تۆخاری (ا) (توخاری، کاراشاری)- لە تورکستانی چین.

٢. تۆخاری (ب) (کوچانی) – هەر ئەوێ لە کووچ تا سەدەی حەوتەمی زایین.

لە دەستنووسەکانی سەدەکانی ٥-٧ ی زایین تەقریبەن دیارە، لەسەر بناغەی ئـەلف وبێی هیندی لە کاتی زەوی هەڵکەندندا لە سەدەی ٢٠ هەمدا دەر کەوتوە .

تێبینی ١: بە پێی بنەڕەت ئەم گرووپانەی زمانە هیندو ئەورووپییەکان لە یـەك نزیك دەبنەوە : هیندۆ –ئێرانی (ئاریایی)، سلاڤیی- بەڵتیقی وئیتالۆ –کیلتی.

تێبینی٢: زمانە هیندۆ –ئێرانییەکان و زمانە سلاڤی یـە-بـەڵتیقی یـەکان ڕەنگـە لە بەشی زمانە – ساپتەمەکاندا یەکبگرنەوە. لە بەرامبـەر ئـەوەدا زمانـانیتر کـە سـەر بـە زمانـە – کێنتۆمـە کا نـن، ئـەم دابەشکردنە لـە ئەنجامـدا دەچێتە سـەر k ǝg

هیندۆ ئەورووپیی سەدەکانی ناوەڕاست کە یەکەمجار لە ڕووی مەخرەجی زمانەوە دەنگیفریکاتیف( دەنگی هێمنی لە یەکدەر )ی داوە( "ستو̌- سەد" - catam،simtas،chto)،دووەم : دەنگی هێمنی پشت زمانی هێشتەوە ، لە زمانە گێرمانیە کاندا بە هۆی جووڵانی دەنگی هێمن – فریکاتیڤەوە centom-kentom،hekaton) ی پاشان) ، hundert و ئەو جۆرە "سەد".

تێبینی ۳: مەسەلەی سەر زمانانی هێندۆ ئەوروپی ڤێنێتی، مێساپسی،بێبەڵگە گرووپی ئیللیدی (لە ئیتالیا ، فریگێیی ، فراکییی "لە بەڵقان" هێشتا بڕیاری تەواوی لە زانستی زمان دا لەسەر نەدراوە. زمانە پێلاگییەکان (پیلۆپۆنیك ناگریك)، ئیتروسکی (لە ئیتالیا تا ڕۆمانییەکان) لیگوری (لەگالییا )، تا ئێستا ئەویش پێوەندیی بە زمانە هیندۆ ئەوروپاییەکانەوە ڕوون نەبۆتەوە.

٢. زمانە سامییەکان - حامییەکان

١. زمانە سامییەکان

١. عەرەبی زمانی نێو نەتەوەیی خوا پەرەستیی ئیسلامە، نووسینیی بە تیپی عەرەبییە ( لە دۆرگەی مالْتا- لەسەر بناغەی ئەلف وبێی لاتینییە).

٢. ئامهاری ( ئەمەریلیا )، زمانی ئەدەبیی ئیسیوبیا (اثیوبیا)یە.

٣. تیگری، تیگرینی، گوراگی، هەراری و زمانیتر. ئەو زمانانەی ئیسیوبیایە کە نووسینیان نییە.

٤. ئاسووری، پاشماوەی ئارامییە.

**مردووەکان**

٥. ئەکەدی( ئاسیرۆ – بابلی)، بە هۆی یادگارە بسمارییەکانی ڕۆژهەلاتی کۆنەوە ناسراوە.

٦. ئوگاریتی.

٧. جولەکانەی کۆن – زمانی بەشە کۆنەکانی ئینجیلە، زمانی پەرستنی کە نیشتەی جولەکەکانە، لە سەدەی سێیەمی پێش زایینەوە، ئێستا بەشێوەی جیاوازییەوە زیندوو کراوەتەوە و بووە بە زمانی ئەدەبیی دەوڵەتی ئیسرائیل بە ناوی عیبریەوە، نووسینی بە ئەلف وبێی جوولەکانە (عیبری)یە.

٨. ئارامی – کتێبە کۆنەکانی ئینجیلە و زمانی هاوبەشی ڕۆژهەڵاتی نزیکە لە سەردەمی ٣ سەدە پێش زایین – ٤ سەدەی زایین.

٩. فینیقی – زمانی فینقییەکان، کارفاگینە (پونیچی) لە پێش زاییندا مردووە. نووسینی بە تیپی فینقیی بووە کە نووسینی بە تیپی ئێستا لەوەوە هاتووە.

١٠. گییز (گیویز) – زمانی ئەدەبیی پێشووی حەبەشەیە سەدەی ٤-١٥ ی زایین بووە. ئێستا زمانی پەرستنە لە ئیسیوبیا.

٢. زمانە میسریەکان

**مردووەکان**

١. زمانی میسریی کۆن – زمانی کۆنی میسرە. بە هۆی یادگار ، هیرۆگلیفی و بەڵگەی نامە دیمۆتیەکانەوە (لە ٣ هەزار پێش زایینەوە تا سەدەی سێیەمی زایینەوە ناسراوە).

٢. قیپتی – پاشماوەی زمانی کۆنی قیپتییە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا سەدەی ١٦ هەمی زایین ، زمانی پەرەستنی کڵێسە ئارسۆدۆکسیی میسرە نووسینی بە قیپتییە ئەلف و بێی لەسەر بناغەی هیرۆگلیفییە.

٣. گرووپی کووشیتی.

١. گاللا

٢. سۆمالی

٣. ئاگایی، سیدامۆ، ساخۆ، بێجاو زمانیتر.

٤. گرووپی بەربەری

١. تواريّگ.

٢. كابيل.

٣. شيلخ (شليّخ).

٤. ريف.

٥. شاڤيا.

٦. تامازيست.

مردووەكان

٧. ليڤييى.

٨. نوميديىى.

٩. گيّتولى.

٥. گرووپى چادۆ - حامى

١. خاوسا.

٢. چادى خۆر ئاوايى: كۆتۆكۆى نگيزى، ئەنگاز، كاريكاريّ، سوورا، ديالێكتى شارەكانى موزگو، مووبى، سۆكۆر وهىتر.

٣. زمانە قەفقاسىيەكان[1]

ا. گرووپى خۆرئاوا: زمانى ئەنجازو – ئاديگى يا ئەنجازو – چەركەسى.

ا. بەشە گرووپى ئە نجازى

[1] مەسەلەى ئەوەى ئەم گرووپانەى نيشاندراون يەك خێزانە زمانن، تائێستا لە زانستدانەبڕاوەتەوە، دەتوانين خێرا بيربكەينەوە، كە پێوەنديى خزمايەتى لە نێواندا نىيە، ئيستيلاحى ((زمانە قەفقاسىيەكان)) ئەوە نيشان دەدات كە لە ڕووى جوگرافىيەوە بڵاون.

١/ ئـەنجازی، شـێوە: بزیبسـی – بـاکووری و ئەبـژووی (یـا کـادۆری) – باشـووری، نووسینی تاساڵی ١٩٥٤ لەسەر بناغەی ئەلف و بێی جۆرجی (گرووزی) بوو، ئێستا لەسەر بناغەی رووسی‌یە.

٢/ ئەبازینی، نووسینی لەسەر بناغەی ئەلف و بێی ڕووسی‌یە.

٢. بەشە گرووپی چەرکەس.

١/ ئادیگێیی (کیاخی، چەرکەسیی خواروو)

٢/ کاباردینی (چەرکەسیی خواروو)

٣/ ئوبیخی (ئوبیخی لە زەمانی تزار "قەیسەر" دا ئاوارەی تورکیا بوون.

ب. ناخی

١. چێچێنی — نووسینیان لەسەر بناغەی ڕووسی هەیە

٢. ئینگووشی

٣. باتسییی (تسۆڤا- توشینی)

پ. گرووپی داگستانی

١. ئەڤاری.

٢. دارگینی.

٣. لێزگینی(کیورینی)

٤. لاکی.

٥. تاباسارانی.

ئەمە پێنج زمانن نووسینیان لەسەر بناغەی ڕووسی هەیە.

زمانەکانیتر نووسینیان نی‌یە.

٦. ئاندێیی.

٧. كاراتینی.

٨. تیندینی.

٩. چامۆلینی.

١٠. باگولالی.

١١. ئاخڤاخی.

١٢. بۆتلیخی.

١٣. گادۆبێرینی.

١٤. تسێزیی.

١٥. بێژێینی.

١٦. خڤارشینی.

١٧. گونزیبی.

١٨. گشیئوخی.

١٩. تساخووری.

٢٠. ڕووتوولی.

٢١. ئاگوولی.

٢٢. کووباچینی.

٢٣. ئارچینی.

٢٤. بوودووخی.

٢٥. کریزی.

٢٦. ئوودینی.

٢٧. خینالووگی.

**ج. باشووری (گرووپی کارتیڤیلی)**

**١. زانی. بەشە گرووپی (مێگریلۆ – چانی)**

**١/ میگریلی. ٢/ چانی (لازی).**

**٢. بەشە گرووپی ئیبیری (کارتڤێلی)**

**گرووزینی(جورجی): نووسینی بە ئەلف و بێی گورجی (جۆرجی)یە هەر لەسەدەی چوارەمی زایینەوە. یادگاری ئەدەبیی سەدەکانی ناوەڕاستی هەیە، بەشە دیالێکتەکانی ئەمانەن: خێڤسووری، کارتالیی، ئیمێرینی، گوورییی.**

**٣. بەشە گرووپی سڤانی**

**سڤانی**

**تێبینی. هەموو ئەم زمانانە (گورجی و ئوبیخی نەبێ) نووسینیان لەسەر بناغەی ئەلف و بێی ڕووسییە لە ساڵانی سەردەمی پێشوو دا چەند ساڵێك بە لاتینی بوون.[١]**

**٤. ئەوەی لە گرووپدا نییە- زمانی باسکی .**

**٥. فیننۆ – ئورگۆری زمانە (ئوگرۆ – فینی)یەکان.**

**ا/ گرووپی ئوگۆری**

**١. مادیاری( هەنگاری ، ڤۆگولی) ، نووسینی بە تیپی لاتینییە.**

**٢. مانسیی ( مانسی، ڤۆگولی)، نووسینی لەسەر بناغەی ڕووسییە (لە ساڵانی ٣٠ی سەدەی بیسەمەوە)**

**٣. خانتیی (خانتی، ئۆستیاتی) نووسینی لەسەر بناغەی ڕووسییە (لە ساڵانی ٣٠ی سەدەی بیستەمەوە.[٢]**

---

[١] لەوانەیە لە ڕووی زانستەوە بسەلێنرێ کە پێوەندیی خزمایەتی لە نێوان گرووپی کارتڤێلی و زمانە مردووەکانی ئاسیای بچووك و میزۆپۆتامیا هەبێ – شوومێری، ئیلامی، خاتتسی، خورریتیو ئورڕاری. ئەوەی زانست ئێستا کاریان لە بارەوە دەکات.
**(تێبینیی وەرگێڕ: ئیلامی لای خۆیان و لای هەموو کورد بەشە دیالێکتێکی کوردییە).**

**[٢] دیالێکتە خانتییەکان چەند جیاوازن، بۆئەوەی بڕوانینە ئەوەی قسە پێکەرانیان کەمن، لەوانەیە دوو یا سێ زمانی خانتیی ببینین.**

ب/ گرووپی فینی (فینلەندی)

١/ بەشە دیالێکتی دەوری بەڵتیق

١. فینی(سوو ئۆمی)، نووسینی لەسەر بناغەی ئەلف و بێی لاتینییە.

٢. سائامی (سائامی، لۆپاری).

٣. ئیستۆنی، نووسینی لەسەر بناغەی ئەلف و بێی لاتینییە.

٤. کارێلی.

٥. فێپسی.

٦. ئیژۆری (ئینگری).

٢/ بەشە گرووپی پێرمی

٧. کۆمی – زیریانی.

٨. کۆمی – پێرمیایی.[1]

٣/ بەشە گرووپی فۆلگایی

٩. مارییی (ماری، چێرێمیسی)، شێوەی چیایی کەناری لای ناوڕاستی فۆلگاو لووگۆفۆ – لای چەپەوە.

١٠. مۆردۆفی: دوو زمانی سەربەخۆ ئێرزیاومۆکشا.

تێبینی: لای زمانی فینلەندی و ئیستۆنی نووسین لەسەر بناغەی ئەلف و بێی لاتینییە، لای مارێیی و مۆردۆفی – نووسین لەسەر بناغەی ئەلف و بێی ڕووسی دامەزراوە ، لای کۆمی – زریانی، ئودمورتی و کۆمیپێرمیایی – لەسەر بناغەی ڕووسییە (لە ساڵانی ٣٠ی سەدەی بیستەمەوە)

زمانە سامۆدییییەکان

١. نێنێتی (یوراکۆ – سامۆێدی).

[1] چەند بەڵگە بۆ ئەوە هەیە وابزانین کە زمانە کۆمی – پێرمیاییییەکان دیالێکتی زمانی کۆمی – زێریانی بن.

٢. نگاناسانی ( تۆنگییی).

٣. سێلکوپی (ئۆستیاکۆ – سامۆێدی).

٤. ئینێی.

تێبینی: لای زانستی هاوچەرخ وایە کە زمانە سامۆێدییەکان خزمایەتی لەگەڵ فینو – ئوگۆرییەکان هەیە. بەڵام تا ئێستا زانست پێوەندیی خزمایەتیی ئەم گرووپە زمانانەی نەسەلماندووە.

٧. تورکییەکان (زمانە تورکییە تەتەرییەکان)[٢]

١. تورکی (جاران عوسمانیبوو)، نووسینی لە ساڵی ١٩٢٩ وە لەسەر بناغەی ئەلف وبێی لاتینییە، تا ئەو کاتە لە ماوەی چەند چەرخدا – لەسەر بناغەی ئەلف و بێی عەرەبی بوو.

٢. ئازربایجانی (توورکی).

٣. تورکمانی.[١]

٤. گاگائوویی.

٥. قرمیی –تەتاری.

٦. قەرەچاییی.

٧. بالکاری.

٨. کومیکی – وەك زمانی هاوبەشی گەلە قەفقاسییەکانی داگستان بەکاردێت.

---

[٢] ئەوە بخەینە بەرچاو کە لە تورکۆلۆجیدا یەك باری سەرنج لە بارەی گرووپەکانی زمانە تورکییەکانەوە نییە، هۆکانی ئەوان لەوەدایە، کە لە ئەنجامدا باری سەرنجی جیاواز لە بارەی ئەم بە گرووپ کردنەوە هەیە.

[١] ئەمە زمانی تورکمانی – کۆماری تورکمانیایە، هەرچی تورکمانی عیراقە ئەوە یا زمانێکی جیایە، یا دیالێکتە و لە ئازەرییەوە زۆر نزیکە. (وەرگێڕ)

٩. نۆگاییی.

١٠. کاریمی.

١١. قازانی – تەتاری (تەتاری – کەنار ڤۆلگا)، پێکەوە لەگەڵ کاسیمۆڤی، مێشێرویی (میشاری)، تێبتیاریاس.

١٢. باشکیری.

١٣. شێوەی تەتاری خۆرئاوای سیبریا : چولێمی، بارابینی، تورینی، توبۆلی، تەتاری شیمی و پیومێنی.

١٤. ئاڵتایی (ئۆیرۆتی لەگەڵ کوماندینی).

١٥. شۆری لەگەڵ زمانە تەتارییەکان کۆندومییەکان و چێرنێڤریەکان.[٢]

١٦. شێوەی حاکاسی (لەگەڵ سوگایی، بێلتیری، کویبالی، کاچینی، کیزیلی).

١٧. توبینی.

١٨. قرەگاسی.

١٩. یاکووتی (لەگەڵ دیالێکتی دۆلگانی)دا.

٢٠. کازاخی (کازاك یا کایساك – قیرغیزی).

٢١. قیرغیزی (قەرە – قیرغیزی).

٢٢. ئوزبێکی.

٢٣. قەرە – قاڵپاکی.

٢٤. ئویگووری (تارانچی).

٢٥. چوڤاشی. تێکەڵ لەگەڵ زمانی فینلەندی – پاشماوەی زمانی بولگاری کامی، نووسینی هەر لەسەرتاوە لەسەر بناغەی ئەلف و بێی ڕووسیبوو.

---

[٢] ئێستا زمانی ئاڵتایی و شۆری یەك زمانی ئەدەبی بکاردێنن لەسەر بناغەی ئاڵتایی.

مردووەکان

٢٦. ئۆرخۆنی – بە پێی لەوحە نووسراوەکان، زمانی دەوڵەتێکی دەسەڵاتداربووە لە سەدەکانی ٧-٨ ی زایینیدا لە باکووری مەنگۆلیا لەسەر ڕووباری ئۆرخۆن.

٢٧. پێچێنی – زمانی کۆچەرەکانی بیابانە لە سەدەکانی ٩-١١ ی زایینیدا.

٢٨. پۆلۆڤیتسی – بە پێی فەرهەنگی پۆلۆڤیتسیی – لاتینی، کە ئیتالییەکان داینناوە. زمانی کۆچەرەکانی بیابانە لە سەدەی ١١-١٤ ی زایین.

٢٩. ئویگووری زمانی (ئویگووریی کۆن)، دەوڵەتێکی گەورە بووە لە ناوەڕاستی ئاسیادا لە سەدەکانی ٩-١١ ی زایینیدا، بە نووسینەوە لەسەر بناغەی ئەلف وبێی گۆڕپاوی ئارامی.

٣٠. چاگاتاییی (یا جاکاتایی) – زمانی ئەدەبیی سەدەکانی ١٤-١٦ ی زایینی لە ناوەڕاستی ئاسیادا.

٣١. زمانی بولگاری، قەیسەرێتیی بولگارییە لە دەم ڕووباری کاما، زمانی بولگاری لقێکە لە بناغەی زمانی چووڤاشی، بەشێك لە بولگاری هاتووتە نیوە دوورگەی بەلقان و لەگەڵ سلافەکاندا تێکەڵبوون، بوون بە ڕەگەزی بەشدار (بەشی گرنگ) لە زمانی بولگاری.

تێبینی وەرگێڕ: (بولگاری و بۆلگاری جیابکەرەوە)

٣٢. زمانی خەزەری: دەوڵەتێکی گەورە بوو لە سەدەی ٨-١٠ ی زایین، لە ناوچەی خوارووی بە یەکتر گەیشتنی رووباری ڤۆلگاودۆن، نزیك بولگار.

تێبینی: ١/ هەموو زمانە تورکییە زیندووەکان، زمانی تورکی نەبێ، نووسینیان لە ساڵانی ١٩٢٨-١٩٣٠ وە لەسەر بناغەی ئەلف و بێی ڕووسی هەیە، تا ئێستا و لەماوەی چەند ساڵێکدا لەسەر بناغەی لاتینی بوو، زۆر زووتر – لەسەر بناغەی عەرەبی بوو (ئازربایجانی، قەتاری قرم، تەتاری قازان و هەموو گەلانی ناوەڕاستی ئاسیا و ئویگووری دەرەوەی سۆڤێت تا ئێستا).

تێبینی: ٢/ مەسەلەی بە یەك گرووپ بوونی زمان تورکی – تەتارییەکان تا ئێستا لە زانستدا بە تەواوی کۆتایی نەهاتووە.

ف. یَ. کۆرش[1] لای وایە سێ گرووپ هەیە: باکووری (ژمارە ٦-١٥، ١٧ ، ١٩-٢٥)

باشووری – خۆرهەڵات (ژمارە ١٦، ١٨، ٢٦-٣٠) و باشووری خۆرئاوا (ژمارە ١-٥)، وەك ڤ . ا بۆگورۆدیتسکی[2] دەڵێت، هەشت گرووپن. باکووری ڕۆژهەڵات (ژمارە ١٧، ١٨، ١٩)، ئاباکانی (ژمارە ١٦)، ئەڵتایی (ژمارە ١٤، ١٥)، ئاسایی (ژمارە ٢٠-٢٤)، باشووری – خۆرئاوا (تورکی) (ژمارە ١-٨) و چوڤاشی (ژمارە ٢٥)، وەك ڤ - شمیدیت[3] دەڵێ: سێ گرووپە:

١. باشووری (ژمارە ١، ٢، ٣).

٢. خۆرئاوایی (ژمارە ١٣، ١٨، ٢٤).

٣. یاکووتیش وەك شمیدت دەڵێ: یاکووتیش دەچێتەوە سەر مەنگۆلی.

لە ساڵی ١٩٥٢ دا ن. آ. باسکاکۆف نەخشەیەکی تازەی پۆلینکردنی زمانە تورکییەکانی خستە بەردەم کە نووسەر لای وایە کە وەك " مێژووی گەشەسەندنی ئاسیای بەردەم و زمانە تورکییەکانە" (بڕوانە "دەنگوباس ئەکادیمیای زانستیی یەکێتی سۆڤێت. بەشی ئەدەب و زمان"، ب ١١ ، چ ٢) لەوێدا بەشی کۆن چووە بە ناو تازەدا و مێژوویی چووە بەناو جوگرافیدا.

ا/ لقی خۆرئاوایی – هوون

١/ گرووپی بولگاری

١. چوڤاشی.

مردووەکان

٢. بولگاری.

---

[1] بڕوانە: ف. یَ. کۆرش، پۆلینکردنی تیرە تورکەکان بە پێی زمان ١٩١٠٠

[2] بڕوانە: ڤ. ا. بۆگۆرۆدیتسکیی، سەرەتایەك بۆ زمانناسیی تەتاری لەگەڵ زمانە تورکییەکانیتر، ١٩٣٤.

[3] بڕوانە:

w. schmid , Die spraehgamilen und sprachenkreise der Erde, 1932.

٣. خەزەری.

٢/ گرووپی ئوگوزی

١. بەشە گرووپی ئۆگووزی- تورکمانی

١) تورکمانی.

٢) تروخمێنی.

مردووەکان:

٣) ئۆگووزی سەدەی ١٠-١١ ی زایین (مەحموود کاشگاری)

٢. بەشە گرووپی ئۆگووزی – بولگاری

١) گاگاوزی.

مردووەکان:

٢) پێچێنێژی.

٣) ئووزی.

٣. بەشە گرووپی ئۆگووزە – سەلجووقی.

١) تورکی (عوسمانی).

٢) ئازربایجانی.

مردووەکان:

٣) سلجووقی.

٤) عوسمانیی کۆن.

٣/ گرووپی کیپچاکی:

١. بەشە گرووپی کیپچاکی بولگاری.

١)	تەتاری ( لەگەڵ کاسیمۆڤی، میشاری و دیالێکتەکانیتر)

٢)	باشکیری.

مردووەکان:

٣) ئوردێنیی زیرینی خۆرئاوایی.

٢. بەشە گرووپی کیپچانی – ئورگوزی:

١) کارایمی.

٢) کززمیکی.

مردووەکان:

٣) پۆڵۆڤێنتسی (کومانی)

٣. بەشە گرووپی کیپچاکی - نۆگایی

١)	نۆگایی.

٢)	کاراکۆڵی.

٣)	کازاخی.

٤/ گرووپی کارالووکی

١. بەشە گرووپی کارالووکی – ئویگووری.

مردووەکان:

١)	زمانی دەوڵەتی قەرەخانی ( بە پێی تۆماری "دیوان لغات الترك"، کتادگو بیلیگ).

٢)	زمانی پاش سەردەمی قەرە خانی.

٢. بەشە گرووپی کارلووکی - خۆرێزمیی

١)	ئوزبەکی.

۲) ئویگووری.

مردووەکان:

۳) کارلووکیی – خۆرێزمیی.

٤) ئوزبەکیی کۆن.

ب. لقی هوونی – ڕۆژهەلآت

۱/ گرووپی ئویگووری

۱. بەشە گرووپی ئویگووری - توکیویی

۱) توڤینی.

۲) قەرەگاسی.

۲. بەشە گرووپی یاکووتی.

یاکووتی (سدولگانی)

۳. بەشە گرووپی خاکاسی

۱) خاکاسی.

۲) کاماسینی.

۳) کیوئیرنی.

٤) شووری.

٥) تووبا، کوماندی و دیالێکتەکانیتر زمانی باکووری ئالْتای.

٦) ساری. ئویگووری (زمانی ئویگووری زەردە).

۲/ گرووپی قیرگیزیی - کیپچاکی

۱) قیرگیزی.

۲) ئالْتایی.

٨. زمانە مەنگۆلیەکان

١) خانی – مۆنگۆلی، نووسینی لەسەر بناغەی ئەلف وبێی مەنگۆلیە، کە لە ئوگوریی کۆنەوە وەرگێڕاوە، لە ساڵی ١٩٤٥ ەوە لەسەر بناغەی ئەلف وبێی ڕووسیە.

٢) بوریات – مەنگۆلی (بوریاتی)، لە ساڵانی ٣٠ی سەدەی بیستەمەوە نووسینی لەسەر بناغەی ئەلف وبێی ڕووسیە.

٣) کالْمیی (ئویراتی)

تێبینی: ڕیزە زمانێکی زۆر بچووکیتر هەیە ( داگوری، دویسیایی، مێنگیری و هیتر)، کە وان لە سنووری چیندا ( نزیکەی یەك ملیون و نیو)ن، هەروەوها لە مەنشۆریا و ئەفغانستان، ژمارە ٢، ٣ کە لە ساڵانی ٣٠ ی سەدەی بیستەمەوە نووسنیان لەسەر بناغەی ئەلف و بێی ڕووسیە، تا ئەودەمە و چەند ساڵێك لەمەوبەر لەسەر بناغەی ئەلف و بێی لاتینی بوو.

٩. زمانە تونگوکو - مەنشۆریەکان

١/ گرووپی تونگوسی

١) مەنشوری (مانچژووری)، بەرەو نەمان دەچێت، یادگاری دەوڵەمەندی سەدەکانی ناوەڕاستی نووسراوی بە ئەلف و بێی مەنشوری هەیە.

٢) نایایی (گۆڵدی).

٣) ئودیایی.

٤) ئولچیی.

٥) ئۆروچینی.

**تێبینی:**

١/ ژمارە ٢، ٣ لە ساڵانی ١٩٣٨ –١٩٣٩ وە نووسینیان لەسەر بناغەی ئەلف وبێی ڕووسی هەیە، تا ئەو کاتە چەند ساڵێك لەسەر بناغەی ئەلف وبێی لاتینی بووە.

٢/ گرووپی زمانە – تورکیـیەکان، مەنگۆلیـیەکان و تونگو – مەنچۆورییەکان – هەندێکجار لە خێزانی ئالتاییدا یەکدەگرن.

١٠. زمانە چینییە - تیبتییەکان

١/ گرووپی تای – چینی

١) چینی – لە ڕووی زۆریی قسەپێکەریانییەوە یەکەم زمانە لە جیهاندا. قسەکردنی میللیی چینی دابەش دەبێ بەسەر ڕیزە گرووپە دیالێکتێکدا کە زۆر بە توندی پێش هەموو شت لە ڕووی فۆنەتیکەوە جیاوازییان هەیە، دیالێکتە چینییەکان ئاسایی بە پێی نیشانەی جوگرافی جیادەکرێنەوە. زمانی ئەدەبی لەسەر بناغەی دیالێکتی باکوور (ماندارینی ) بریتییە لە دیالێکتی پایتەختی چین شاری پەکین.هەزاران ساڵ ڤێنیان، زمانی دەربەگیی کتێب زمانی ئەدەبیی چین بووە، لە سەدەی بیستەمەوە بایخویا بووە بە زمانی ئەدەبیی قسەکردن، لە ساڵانی پەنجای سەدەی بیستەمەوە تا زمانی ئەدەبیی یەکگرتوویی چینی پێی ئەڵێن پوننخوا (لەسەر بناغەی دیالێکتی باکووری پەکین)، زمانی چینی لە یادگاری نووسراودا دەوڵەمەندە هەر لەسەدەی ١٥هەمی پێش زایینەوە. بەڵام سروشتە هیرۆگلیفی یەکەی لێکۆڵینەوەیمێژووی زمانی چینی گران دەکات. لەساڵی ١٩١٣ەوە لەپاڵ نووسینی هیرۆگلیفیدا نامەی تایبەتیی سیلابی – فۆنەتیکی (چژوان تسزیمو) لەسەر بناغەی خەتی نەتەوەیی بۆ لەیەکچوونی تەلەفوزی خوێندنەوە هیرۆگلیفی لەدیالێکتەکاندا بەکارهاتووە. درەنگتر کار لەزیاتر لە١٠٠ پرۆژەی جیای چاکردنی نووسینی چینیدا کراوە، کەلەهەموویان خاوەن ئاسۆتر پرۆژەی نووسینی فۆنەتیکە لەسەر بناغەی خەتی لاتینی.

٢. دونگانی؛ لای دونگانی دەرەوەی سۆڤێت نووسین عەرەبییە، لای دونگانی یەکێتیی سۆڤێت لەسەرتاوە بەچینی (هیرۆگلیفی)بوو. درەنگتر بوو بەعەرەبی، لەساڵی ١٩٢٧ەوە لەسەر بناغەی لاتینی بوو، بەڵام لەساڵی ١٩٥٠ەوە لەسەر بناغەی رووسییە.

٣. تایی- زمانی دەوڵەتیی تایلاندە تا ساڵی ١٩٣٩ زمانی سیاسی دەوڵەتی سیام بوو)

٤. لاوسی.

٥. چژوانی.

٦. ڤێتنامی (زووتر: ئەننامی)

تێبینی. هەندێك لێكۆڵینەوە زمانی ڤێتنامی دەبەنەوە سەر زمانە ئاوسترۆ ئاسیاییەکان

ب. گرووپی تیبت – بیرمانی

١. تیبتی.

٢. بیرمانی.

١١. زمانە دراڤیدییەکان

(زمانە دۆنیدو ئەورووپاییەکانی دانیشتوانی نیوەدورگە)

١. تامیلیی.

٢. تێلووگوو.

٣. مالالیام.

٤. کانّنادا (کانّنارا)

٥. توولوو

٦. گۆندی

٧. براخووی

١٢. لەدەرەوەی گرووپ – زمانی بورژایی (ڤێرشێکی)

١٣. زمانە ئاوسترۆ ئاسیاییەکان

١. زمانەکانی موندا، سانتالی، مونداری، خۆ، بخوماجیو زمانیتر.

٢.زمانەکانی کخمێر

٣. زمانەکانی مۆن (کخاسی، پالێنگ، نیکۆبارو هیتر)

٤. گرووپی مالاککسی (سێمانگ، سێنۆی)

٥. زمانە باشووریە خۆرهەڵاتیەکان (چام، رادۆی، جارای)

١٤. زمانە مالایی پۆلینێزییەکان

ئا- مالایی، یاگرووپی ئیندۆنیزی.

١. بەشە گرووپی سۆمەترەیی

١. ئیندە نووزی، ئەم ناوەی لەسالآنی ٣٠ی سەدەی بیستەمەوە دراوەتێ، ئێستا زمانی دەوڵەتیی ئیندۆنێزیایە.

٢. باتاکی.

٣. ئاچێ.

٢. بەشە گرووپی ئاڤانی.

١. یاڤانی

٢. سووندانی

٣. مادووری

٤. بالی.

٣. بەشەگرووپی دایاکی، یاکالیمانتانی.

دیاکیو هیتر

٤. بەشەگرووپی سێلێبسیی

١. تۆریجی

٢. بووگیی.

٣. میناخاسی

٥. بەشەگرووپی فیلیپینی.

١. تاگالی (تاگالۆگی)

٢. ئیلۆکانی.

٦. بەشەگرووپی مەدەغەشقەری.

**مالگاشی**

**مردووەکان:**

**کافی- زمانی ئەدەبیی یاڤانیی کۆن: یادگارەکانی لەسەدەی ٩هەمی ز — ەوەیە؛ لەرەچەڵەکدا زمانی یاڤانیی گرووپی ئیندۆ نۆزی بەکارتێکردنی زمانە هیندییەکان (سانسکریت) بەکارهاتووە.**

**ب. گرووپی پۆلینێزی.**

**١. رۆژهەڵاتی: ماوری، گاڤایی.**

**٢. خۆرئاوایی: سامۆوا، ئوڤێیاو هیتر**

**١٥. زمانە ئوسترالیاییەکان**

**زۆر لەزمانە بچووکەکانی دانیشتووە ئەسڵییەکانی ناوەڕاستو ژوورووی ئوستralیا، هەرە ناسراویان ئارانتایە.**

**١٦. زمانەکانی پاپوا (پاپوایی)**

**زمانەکانی بەشی ناوەڕاستی دۆرگەی گینیایی نوێیە.**

**١٧. زمانەکانی دانیشتووە ئەسڵییەکانی ئەفریقا[١٩]**

**١. زمانەکانی بانتوو**

[٢٦] پۆلینکردنی گرووپی زمانەکان ئەفریقا بەپێی کۆمەڵە ووتاری "زمانناسیی ئەفریقا" (چاپی ئەدەبیاتی بێگانە، مۆسکۆ، ١٩٦٣) کراوە.

١. گرووپی باکوریی- خۆرئاوایی.

١. بووبێ

٢.لووندوو.

٣. فانگ.

٤. بینگاو ئەوانیتر.

٢. گرووپی باکووری

١. کۆنجۆ

٢. گاندا (لووگاندا)

٣. رووندیو ئەوانیتر

٣. گرووپی زمانەکانی حەوزی کۆنگۆ

١. کۆنگۆ

٢. ندۆنگۆ

٣. پۆتۆ

٤. نگالاو ئەوانیتر

٤. گرووپی ناوەندی

١. لووبا

٢. بێمبا.

٣.سووبیاو ئەوانیتر

٥- گرووپی رۆژهەلاتی

١. سەواحیلی

٢. سانگۆ

٣. شامبالاو ئەوانیتر

٦. گرووپی باشووریی- خۆرهەڵاتی.

١. زوولوو

٢. سۆتۆ

٣. ڤێندا.

٤. شۆناو ئەوانیتر

٧. گرووپی خۆرهەڵاتی

١. ندۆنگا

٢. لووانداو ئەوانیتر

٢. زمانە بانتۆیدنی‌یەکان (رۆژهەڵاتی‌یەکان)

١. تیڤ

٢. بامیلێکێ

٣. بالی.

٤. ئیفیكو ئەوانیتر.

٣. زمانە بانتۆیدنی‌یەکان (ناوەندی‌یەکان)

١. سینۆفۆ٠

٢. کوولانگۆ.

٣. مۆسی.

٤. گورماو ئەوانیتر

٤. زمانە بانتۆیدنی‌یەکان (خۆرئاوایی‌یەکان، ئەتلاتیکی‌یەکان)

١. گۆلا.

۲.تێندا

۳.فۆمی.

٤. ڤۆلۆف

٥. فوولو ئەوانیتر

٥. زمانەکانی ماندا

١. ماندینگۆ

۲.مالینکێ

۳. بۆمبارا.

٤. مێندێ.

٥. لۆماو ئەوانیتر

تێدابووە، لەسەدەی ١٥هەمەوە- نووسینی میللی کۆری"ئۆنموون" سیستێمی خشتەی حەرفی- سیلابی هەیە.

٤. ئاینیی.

۲١. زمانە ئەسکیمۆییەکان

١. ئەسکیمۆیی (یویتی)

۲. ئەلێوتیی (ئونانگانی)

تێبینی: رەنگە، ئەم زمانانە پێوەندیی خزمایەتی یان لەگەڵ ئەو زمانانەدا هەبێت کەپالێو ئاسیاییان پێدەڵێن، پێوەندیی خزمایەتی ئێستا بۆ گرووپی چوکۆتی دیارە.

۲۲. زمانەکانی باکووری ئەمەریکا.

١. ئەلگونکینی (ماسساچوسێست) دێلاڤار، مۆخێگان، میکماخ، فۆکس، کری، ئۆجیبڤێ، پۆتاڤاتۆمی، یللینۆیس، شێیێنی، بلاکفووت، ئاراپاخۆو ئەوانیتر)

٢. پرۆکێزی (چیرۆکی، توسکارۆراو ئەوانیتر)

٣. سیو (بیلۆکسی، ئۆفۆ، توتێلۆ، کۆتلێباو ئەوانیتر)

٤. ناتچێز- مۆسکۆگ (ناتچێز، ئالاباما، چیکاساڤ، چۆکتاڤو ئەوانیتر)

٥. ئەتاباسکی (خایدا، تلینگیت، ناڤاخۆ، تسیمشیان، کوتێنای، خوپا، ماتۆمو ئەوانیتر)

٦. مۆسی (کڤاکیوتل، چێخالیا، کالیسپێل، نوتکا، چیماکوم، کیلیۆتیو ئەوانیتر)

٧. پێنووتی.

٨. خۆکا (کارۆك، شاستا، یانا، چیما ریکۆ، پۆمۆ، سالیناو ئەوانیتر)

٢٣. زمانەکانی ئەمریکای ناوەراست

١. ئوتۆ- ئاستێکیی (ناخواتل، شۆشۆنیی، خۆپیو ئەوانیتر)

٢. مایا( میم، کێکچی، کاکچیکۆل، پۆکونچی، پۆکۆمام، ئکسیل، تزێلتال، تزۆتزیل، تۆجولابال، چۆل، یوکاتیك، چۆرتی، خواکستێكو ئەوانیتر)

مایا پێش گواستنەوەی ئەوروپاییەکان پلەیەکی بەرزی کلتوورییان وەدەست هێناوە و نووسینی خۆیان هەبوو، کەزانا هاوچەرخەکانی بەنهێنیی نیشانەکانییەوە خەریکن.

٣. زمانەکانیتری ئەمەریکای ناوەراست: ئۆتۆمانگ، میسکیتا – ماتاگالنا، چیبچاو ئەوانیتر.

٦. زمانە کینیاییەکان

١. کروو.

٢. کڤا.

٣. ئاکان.

٤ . یڤیی.

٥ . یۆرووبا.

٦. نووپیَ.

٧. یدۆ.

٨. یبۆ.

٩. تڤیو ئەوانیتر.

٧. زمانەکانی سۆنگای

١. سۆنگای

٢. زارما.

٣. دێندی.

٨. زمانەکانی کانووری - تێدا

١. کانووری.

٢. تێدا.

٩. زمانەکانی ناوەراستو رۆژئاوای سوودان

١. زاندا

٢. باندا

٣. میلتوو

٤. بێرتا

٥. کۆما

٦. بارێیا

٧. کوماناو ئەوانیتر

١٠. زمانە کوردۆڤانییەکان

١. تالۆدی

٢. لافۆفا

٣. تاگیلی‌و ئەوانیتر

١١. زمانە نیلۆنی‌یەکان

١. نوویر

٢. شیللوك

٣. باری

٤. نیانگیا

٥. پۆکۆت

٦. گۆلاو ئەوانیتر

١٨. زمانە پالێزۆ ئەفەریقی‌یەکان (کۆنەکان)

١. زمانە بووشمێنی‌یەکان (سامۆنازڤانی: سانی)

٢. گۆتتێنتۆتی‌یەکان زمانە (سامۆنازڤانی: ناما)کان

١٩. زمانە پالێزۆئاسیایی‌یەکان ([٢٠])

## ئا- گرووپی چوکۆتی.

١. چوکۆتی (لوۆراڤێتلانی)

٢. کۆریاکی (نیمیلانی)

٣. کامچا دالی (یتێلمێنی)

---

٣٧زمانە پالێو ئاسایی‌یەکان، ناوێکە بەستراوە بەمەرجی خۆیەوە، گرووپی چوکۆتی بریتی‌یە لەهاوبەشیی چەند خزمەزمانێك، زمانەکانیتر بەخێرایی بەپێی ئیشارەتی جوگرافی دەچنە ناو پالێو- ئاسیایی‌یەکانەوە.

ب. گرووپی سیبیری

١. ئۆدوولی (یوکاگیری)

٢. نیڤخی

**ج. زمانی کێتی**

هەندێ زانا لایان وایە ئەم زمانە لەرەچەڵەکدا خزمایەتیی لەگەڵ زمانە تیبتی‌یە چینی‌یەکاندا هەیە، هەروەها هەلگرانی دانیشتووی ئەسڵیی ێنیسێیا نەبوو، بەڵکو لەباکوورەوە هاتوون و لەناو گەلانی دەوروپشتدا تواونەتەوە.

٢٠. زمانانی جیاوازی ڕۆژهەڵاتی دوور کەناچنە ناو هیچ گرووپێکەوە.

١. ژاپۆنی: نووسینی لەسەر بناغەی هێرۆگلیفیی چینی سەدەی ٨ هەمی زاینە، نووسینی تازەی فۆنەتیکیی سیلابیی کاتاکان و خیراگانە.

٢. ریۆکیویی، بەڵگەی ناوێ کەخزمی ژاپۆنی‌یە.

٣. کۆریایی؛ یادگاری یەکەمی لەسەربناغەی هیرۆگلیفیی چینی‌یە لەسەدەی ٤هەمی زاینەوە، گۆڕینی لەسەدەی ٧ی ز دا تێدابووە، لە سەدەی ١٥ هەمەوە — نووسینی میلیی کۆری "ئۆنموون" — سیستێمی خشتەی حەرفی — سیلابی هەیە.

٤. ئایینی.

٢١. زمانە ئەسکیمۆیی‌یەکان

١- ئەسکیمۆیی (یویتی).

٢- ئەلیۆتیی (ئونانگانی).

**تێبینی:** ڕەنگە، ئەم زمانانە پێوەندیی خزمایەتی‌یان لەگەڵ ئەو زمانانەدا هەبێت کە پالیۆ ئاسیایی‌یان پێدەڵێن، پێوەندیی خزمایەتی ئێستا بۆ گرووپی چوکۆتی دیارە.

٢٢. زمانە باکووری ئەمەریکا

١.  ئەلگونکینی (ماساچوسێتس)، دیلاڤار، مۆخێگان، میکماخ، فۆکس، کری، ئۆجیبڤێ، پۆتاڤاتۆمی، یللینۆیس، شێیێن، بلاکفووت، ئاراپاخۆ و ئەوانیتر).

٢.  یرۆکێزی( چیرۆکی، توسکارۆرا و ئەوانیتر).

٣.  سیو ( بیلوکس، ئۆفۆ، تۆتیلۆ، کۆتلێبا و ئەوانیتر).

٤.  ناتچێز – موسکۆگ (ناتچێز، ئالاباما، چیکاساڤ چوکتاڤ و ئەوانیتر).

٥.  ئەتاباسکی (خایدا، تلینگیت، ناڤاخۆ، تسیمشیان، کوتێنای، خوبا، ماتۆم و ئەوانیتر).

٦.  مۆسی (کڤاکیوتل، چێخالیا، کالیسپێل، نوتکا، چیماکوم، کیلێوتێ و ئەوانیتر).

٧.  پێنووتی.

٨.  خۆکا ( کارۆك، شاستا، یانا، چیما، یکۆ، پۆمۆ، سالینا و ئەوانیتر).

٢٣. زمانەکانی ئەمریکای ناوەڕاست

١-  ئوتۆ – ئاستێکیی (ناخواتل، شۆشۆنی، خۆپی و ئەوانیتر).

٢-  ماییا ( میم، کێکچی، کییچێ، کاکچیکۆل، پۆکونچی، پۆکۆمام، ئکسیل، تزێلتال، تزۆتزیل، تۆجولابال، چۆل، یوکانێك، چۆرتی، خواکستێك و ئەوانیتر).

مایا پێش گواستەوەی ئەوروپاییەکان پلەیەکی بەرزی کلتووریان وەدەست هێنا و نووسینی خۆیان هەبوو، کە زانا هاوچەرخەکانی بە نهێنیی نیشانیەکانییەوە خەریکن.

٣. زمانەکانیتری ئەمەریکای ناوەڕاست: ئۆتۆمانگ، میسکیتا، ماتاگالنا، حسبحا و ئەوانیتر

٢٤- زمانەکانی باشووری ئەمەریکا

١)  تووپی – گوارانی.

٢)  کێچوا – زمانی دەوڵەتی کۆنی ئیکیە لە پێرۆ. ئێستا لە پێرۆ و بۆلیڤیی و ئیکڤادۆر هەیە.

٣) ئارافاكی.

٤) ئراوكانی.

٥) چۆن.

٦) ئالاكووف.

٧) پانۆ.

٨) گرووپی كاریبی.

٩) ژێ.

# چاپخانەی (سلمان الاعظمي)- بەغدا

ئەگەر دوێنێ مامۆستاکان

یەک سوڵتانیان پێ ئەگەیان

ئەمڕۆ ئەبێ مامۆستای کورد

دانیشێو بەڕاوێژی وورد

ڕێگای پێگەیاندن دانێ

بەملیۆنان نەک سوڵتانێ

لەبێشکەی بن هەر سێبەرێ

سبەی ئەگەر بێتە دەرێ

خانزادێ ، صەلاحەددینێ

کاکە مەمێ ،خاتووزینێ

ئەوسا بەستەی بێ خەمیمان

چی هی پێنووس ،چی دەمیمان

بەتاقەیەک زاری یرین

شاخ پڕئەکا لەپێکەنین

ئەوسا:اخانی! خانیی سەردەم

بەزمانێک ئەنووسێ مەم

کەپێی ئەدون انالی!وامەحوی!!

وەک اقوبادی!ووەک امەولەوی! !

گۆران

# خوێندەواری خۆشەویست

هەوڵی لەمەسەلە گەیشتن‌و گەیشتنە ئەنجامێکی عیلمیی ڕاست دەربارەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو پاڵی پێوەنام کەلەزۆر سەرچاوەدا بۆئەم باسە بگەڕێم‌ولەڕێگەی مێژووی خۆمان‌و گەلانی ترەوەو لەسەر بناغەیەکی پتەوی باوەڕو فەلسەفە کە زمان لەکۆمەڵ‌و میللەت‌و مێژوو جیاناکاتەوە ،نەخشەیەك لەبیری خۆمدا بۆئەو زمانی ئەدەبیی یەکگرتووە بکێشم کەزۆر هۆ وامان لێدەکا بەئاواتی بخوازین.

پاش ئەوەی‌ئەو نەخشەیەم لا جێگیر بوو ،وپاش ئەوەی باسەکە لەچوار دیواری دانشگاو دەزگای زانست دەرچوو وبوو بەباسێك‌و ئەرکێك لەئەرکەکانی بزووتنەوەی نەتەوەیی‌و پلەی ئێستای بەرەو پێش چوونی زمان‌و ئەدەبیاتی کوردیمان‌و بوو بەمەسەلەیەك کە باری ژیان‌وبەسەرهاتی ئەمڕۆی وولآت چارکردن‌و نەخشەکێشانی بوێت‌وبڕیاری خێرای دەربارەی بوێت ۰ پاش ئەمە بەپێویستم زانی کە ئەو نەخشەیە بخەمە بەرچاو بەهیوای ئەوەی کەزاناو ڕۆشنبیرو شارەزایانی کورد لە داچەسپاندن‌و هەوڵ بۆدان یا لە لێ گۆڕین‌و پوختەکردن‌و موناقەشەی‌دا بەشداربن ۰

لەبەر ئەوە لەشێوەی وتارێکی درێژدا بەشی یەکەم‌ودووەمیم لەگۆڤاری(برایەتی)دا بلآوکردەوە ۰ بەلآم هەندێ هۆ وای کرد کە هەمووی بلآونەکەمەوە و هەر بەو هیوایەو بۆ سوودبینینلەو ئەرکی خوێندنەوەیەی کێشام ، ئەم باسە بووبە کەرەستەی چەند دەرسێکی‌قوتابیانی بەشی کوردیی کۆلێجی ئادابی دانشگای بەغدا ۰ دیارە دەرسەکان لەشێوەی لێدواندابوون‌و نەنووسرابوونەوە ۰بەلآمئارەزووی قوتابیانی ئەو بەشە لەلایەك کە حەزیان بەوە دەکرد ئەوەی بیستویانە بەچاپکراوی بیخوێننەوەو ئارەزووی خۆشم لەلایەکی تر کەحەز بەوە دەکەم کە باسەکە بخەمەبەردەمی هەموو ڕۆشنبیران بۆ ئەوەی لێی بکۆڵنەوەو لێی بدوێن‌و ئەنجامی لێدوان‌ولەسەر نووسینی ئەوان سروشتی بڕیارێکی عیلمی بدا بەو ئەنجامانەی من گەیشتوومێ ۰ ئەم دووئارەزووە پاڵی پێوەنام کەکورتکراوەیەکی پوختەی ئەو

دەرسانە لەم چەند لاپەڕەیەدا چاپ بکەم •لەبەرئەوەی باسەکە بەم جۆرە هاتەکایەوە ،بۆیە لەپێڕەوی تازەی کتێب دانان نەختێ لامداو لاپەڕە بەلاپەڕە ئەو سەرچاوانەم نیشاننەدا ،کەسوودم لێوەرگرتوون •بەڵکوزۆر نموونە ڕای وەرگیراوم تۆمار نەکرد ،کە بۆئەم باسەئامادەکرابوون •

بەکورتی ئەمەی دەیخوێنیتەوە کورتکراوەی کتێبێکی گەورەیە کەئەم باسە گرنگە ڕوون بکاتەوە •بەڵام ئەوزروفە تایبەتیە وای کرد کەکورتەکەی پێش کتێبەکەخۆی بنووسرێت‌و چاپ بکرێت• دیارە لێدوانێکی عیلمیی هێواشی ئەم باسە یارمەتیی تەواوم ئەدا کەزووترو پوختەتروبەپێگەیشتوویی ئەو بەرهەمە ئامادەبکەم‌و ئەرکە سەرشان بەرامبەر بەم مەسەلەگرنگەی‌دواڕۆژی ڕۆشن بیریی نەتەوەکەمان بەجێ بێنین•

ئەوەی دەیخوێنندەوە ریەکی ڕێك‌و ڕەوان و گەر لەگەڵ عاتیفە وئارەزووی هەندێ کەسیشدا نەگونجێ ئەوا پەڕاندنەوەم هەر بەدڵسۆزیی بێ پایان‌و بێ مەبەسە بۆنەتەوەی کوردی مەزن‌ودواڕۆژو مەسەلەو بەختیاریی ڕەنج کێشانی ، بەخۆبەخشین‌و تەرخانکردنە بۆ خزمەتی زمان‌و ئەدەبیات‌و وشەی پاکی•

وائەزانم پاکی‌ودڵسۆزی تەرازوی زانست لەبەرچاو دانانیش دەمانگەیەنێتە ڕاستی‌و دەمانخاتە سەر ڕێبازی ڕاستەقینەی خەزمەتی میللەت‌و هیوای مەردانەی ئادەمیزاد •

بەهیوای لێدوان‌و ڕادەربڕین‌و گەیشتنە ڕاستیی هەمووڕۆشنبیرانی کورد ،ئەم چەند لاپەڕەیە پێشکەش دەکەم•

# سەرەتا

لەمڕۆژانەداو بەبۆنەی دەرچوونی یاسای ئەکادیمیای زانستیی کوردیەوە،لەزۆر شوێن‌و تەنانەت بەنووسینیش ،باسی زمانی کوردی‌ودیالێکت(لهجە)کانی‌و زمانی یەکگرتووزمانی ئەدەبیی یەکگرتوو هاتۆتە ناوەوە.

زۆر کەس هەوڵی ئەوە دەدات لەسنووری زانینی خۆیداشتێك لەبارەیەوە بڵێ یان بنووسێ:بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە کەزۆر کەس بێ وەوەی هەست بەمەسئولیەتی دواڕۆژ بکەن یا بێ ئەوەی تۆزێکیش سەروسیمای سواری ئەوەمەیدانەیان هەبێ ئەسپی خۆیان بەئارەزووی دڵی خۆیان تاوئەدەن‌ونەخشەی دواڕۆژ بۆزمانی کوردی‌وبۆشتێك کەبەهەڵە ناونراوە یەکگرتنی زمانی کوردی ئەکێشێ‌وڕەنگە لەبارێکی ووڵاتیشدا کە (تەرازوو)ی‌ڕاستەقینەی زانست جێگەی‌خۆی نەگرتبێ ،قسەی ئەمانەبخوات‌و ڕاوێژونەخشەیان تۆزێ کۆسپ بخاتە ڕێگەی ئەو بەرەوپێش چوونەی زمانەکەمان کەوەك مێژووخۆی ڕێگەی بەرەوپێشەوە هەر ئەبڕێ ڕۆڵ (دەور)ی خەڵکیش یاپاڵپێوەنانی ئەو بەرەوپێش چوونەیەیاکۆسپ لەڕێگەیا دانانە بەڵام بێ ئەوەی بتوانن ڕابگرن یا لەسەرەنجاما بەرەودواوەی‌بەرن .

ئەم باسە ئەنجام‌و بەرهەمی بەدوای ڕاستی‌وزانستی‌یا گەڕانی ئەم مەیدانەیە .زانستێکیشی کەسوودی‌ژیانی گەلی تیابێ بریتی‌یە لە دووبنەڕەت:تیوری(نظرية) و پراکتیك( تطبيق) .

لەم مەیدانەشدا تیوری‌یەکە نووسینی زانایان‌و ڕای شارەزایانە کەلەووڵاتی پێشکەوتووا ئەنجامی چەندسەد ساڵەی کۆششی عیلمی‌یە.

پراکتیکەکەش‌بریتی‌یە لەبینینی زەویی پەیدابوونی ئەو تیوری‌یە.کەگەلانی زیندووون‌وبیستنی قسەوباسی‌وخوێندنەوەی ئەدەبیاتیانە.

ئەم گەرمو گوڕییەی لێ دوانولەسەرنووسینی باسەکەو شوێنی بلاَوکردنەوەشی-بووە هۆی ئەوەی ئەم باسە لەم فۆڕمەی ئێستادا بلاَوبکەینەوە ئەم ووتارە لەباریا هەیە لەدواڕۆژدا ببێتە بناغەی لێکۆڵینەوەیەکی عیلمیی فراوان وگەلێ بەلگەی لەڕای زانایان بخرێتە پالّ، بەلاَم ئەمە هیچ لەناوەڕۆكوئەنجامی باسەکە خۆی ناگۆڕێ.

زمان .. زمانی یەکگرتوو

زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو

زمان کە هۆیەکە لەو هۆیانەی ئادەمیزاد بە کۆمەڵەوە دەبەستێ . لەسەرەتای دەست بە پەیدابوونییەوە تادوا شێوەی دا چەسپاندنی ئەمڕۆی ڕیزە ڕووداوێکی دیوە . ڕەنگە هەر زمانە ڕێبازێکی تایبەتیی خۆی بووبێ . بەلاَم وەك لە هەموو دیمەنێکی ژیانا تێ گەیشتنە تایبەتییەکەی فەلسەفە دەبینرێ ، کە هەموو شت ((گشتی)) و ((تایبەتی))ی تیایە . هەموو زمانێکیش لە ڕێڕەوی دروست بوونی خۆیدا ، بەم ((گشتی)) و ((تایبەتی))یەدا تێپەڕیوە . دیمەنی ((گشتی)) ی بەرەو پێش چوونی هەموو زمانەکانی جیهان یەکەو هەر زمانەش ڕێبازی تایبەتیی هەیە .

ئەنجامی بەرەو پێش چوونی زمان ئەوەیە کە گەلێك یا نەتەوەیەك — زمانی یەکگرتوو — ی خۆیی دەبێت .

جاری واهەیە زمانێك لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی چەند دیالێکتێکەوە پەیدا دەبێت . یا جاری وا هەیە زمانی نەتەوەیەك لە زمانی تێکەڵبووی چەند گەلێکەوە پەیدا دەبێت . ئەوەش دەبێت کەرەگەزی ئەو چەند زمانە یەك بێت ، یا جیاوازبێت .

هەندێ جار کە وولاَتی گەلێك داگیردەکرێت ، زمانی گەلە داگیرکراوەکە لەناو دەچێت . ڕوووداوی واش لە مێژوودا هەیە کە گەلە داگیرکەرەکە زمانی خۆی لە بیرچووبێتەوە و زمانی گەلە داگیرکراوەکە زالّ بووبێ . دەربارەی چەشنی دروست بوونی زمانی کوردی ئێستا چەند لێکۆڵینەوەیەکی باشمان لێرە و لە دەرەوە هەیە . ئەمە باسی ئێستای ئەم نامەیە نییە . بەلاَم ئەوەی لەم باسە وەردەگیرێ ئەوەیە کە هەرچەند زمانی یەکگرتووی کوردی لە چەند دیالێکتێکەوە پەیدابووە . بەلاَم دروست

بوونی زمانی یەکگرتوو فەوتان و نەمانی دیالێکت ناگەیەنێ . چونکە زمانی یەکگرتوو شتێکە و دیالێکت شتێکیتر .

لەگەڵ گەشەسەندنی زمانی یەکگرتووشدا دیالێکتەکانی زمانیش هەریەکە بە ڕێگەیەکدا گەشە دەستێنێ و دەبنە گەنجی ووشە وەرگرتن و بە پەیدابوونی (نەتەوە) وە – مەبەس نەتەوەیە بە مانای عیلمی تازە [1] . بەڵام زۆر جار پێش ئەوەش کە مەرجەکانی نەتەوە لەگەڵێکدا تەواو بێت کە زمان یەکێکیانە ، زمانی یەکگرتوو پەیدادەبێ .

زمانی یەکگرتووی کوردی دەمێکە پەیدابووە ، بۆ سەلماندنی ئەمەش با بزانین ئەو مەرجانە چین کە زمانێکیان پێدەبێت بە زمانی یەکگرتوو .

فیلولۆژەکانی هەموو جیهان ئێستا لەسەر ئەوباوەڕەن کە یەك بوونی سێ شت لە چەند دیالێکتێکی زماندا ئەو زمانە ئەکات بە زمانێکی یەکگرتوو . ئەم سێ شتەش ئەمانەن :

١- گراماتیکی زمان .

٢-فۆنەتیك .

٣-بنەڕەتی فەرهەنگی زمان .

ئەوانەی مارکسیزم ئەکەن بە چرای بیرکردنەوەیان لە هەموو زانستێك ، دەبێ لە ڕووی زمانەوانییەوە ئاگاداری موناقەشەکەی نێوان ((ماڕ)) ی زانا و ((ستالین)) بن ئەوەش دەزانن کە ستالین لە کاتی خۆیدا هەر گراماتیك و بنەڕەتی فەرهەنگی زمانی کردبوو بە نیشانە بۆ یەکێتیی زمان . بەڵام فیلۆلۆژە مارکس یەکانی ئێستا (فۆنەتیك) یش ئەکەن بە نیشانە و مەرجێکی تریش ئەهێننە کایەوە ، کە ڕەنگە هەندێ لەو زانایانەی بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلان بە دروستکەری هەموو دیمەنێکی مێژوو و

---

[1] تا ئێستا زۆر لە زانایان تەعریفی نەتەوەیان کردووە ، بەڵام پوختەترینیان هەر ئەو تەعریفەی (یوسف ستالین) ە کە ئەڵێ : نەتەوە کۆمەڵێکی جێگیر بووە لە خەڵك لەبەرەو پێش چوونی مێژوودا دروست بووە یەك زمان و یەك زەوی و وولات ... [14] _ ئابووری یەکگرتوو سایکۆلوژیەتێکی ئەوتۆیان هەیە کە بەشێك بێت لە کەڵچەری هاوبەش .

ژیـان نـازانن بـه نـاوی زانسـت و مەوزوعیيەتـەوە دان بـەو مەرجـەدا نـەنێن . ئـەو مەرجەش (ڕای میللەتە) دەربارەی زمانەکەی خۆی بـۆ نموونـە : پـێش شۆڕشـی مـەزنی ئۆکتۆبەر لە باسەکانی زمانەوانە رووسەکاندا ئەنووسرا دیالێکتی ئـۆکراینی و دیـالێکتی بێلەڕووسـی ، بـەڵام پـاش ئـەو شۆڕشـە زمانەوانـە سـۆڤیتییەکان ئەنووسـن ، زمـانی ئۆکراینی و زمانی بیلەڕووسی ، چونکە ئەو دوو گەلە خۆیان بە گەلی سەربەخۆ دەزانن و زمانەکەیان بە زمانێکی سەربەخۆ دەزانن . هەرچەندە شـۆڤێنییە ڕووسـەکانی پـێش ئۆکتۆبەر ئەمانیان بە نەتەوە نەزانیوە و زمانەکەیانیان بە دیالێکتی ڕووسی زانیوە .

زمانی کوردی – بەهەموو دیالێکتەکانییەوە ، بە زمـانێکی سـەربەخۆ و یـەکگرتوو ئەژمێررێ .

هەنـدێ لـە زاناکـان ، بەتایبـەتی بێگانـەکان کـە دێنـە سـەر باسـی زمـانی کـوردی و دیالێکتەکانی تەنیا لە دیمەنی جیاوازیی نێو دیالێکتـەکان دەدوێـن ، بـەڵام لێکۆڵینـەوەی ووردی هەندێ زانا ئەوە دەسەلمێنێ کە زمانی کوردی یەك زمانە .

کاتێ کە ئەم باسە دەچێتە قالبی ئەو لێکۆڵینەوە فراوانەوە کە باسمانکرد، پشـت بـە زانسـت ئـەوە دەسـەلمێنن کـە گراماتیـك و فۆنـەتیك و بنـەڕەتی فەرهـەنگی هـەموو دیالێکتەکانی زمانی کوردی یـەکن ، وورده جیاوازییـە کـە هەیـە ، هـەر ئەوەیـە کـە لـە دیـالێکتی هـەموو زمانـەکانی جیهانـدا بـە زیـادەوە هەیـە . ئەمـە ڕای گـەلیش لـەولاوە بوەستێ ، کەلە هەر کوردێك بپرسی : لە هەولێر یا ماردین یا کرماشـان یـا هـەورامان . کە ئەو زمانەی پێی ئەدوێی چییە ؟ ناڵێ – سۆرانی یا کرمانجی یا لـوڕی یـا گـۆرانی (هەورامی) بەڵکو ئەڵێ – کوردی .

زمانی یەکگرتوومان هەیە . زمانەکەش چوار دیالێکتی گەورەی هەیـە [٢] و هـەر دیالێکتەش چەند لقێکی لێئەبێتـەوە . ئـەم دیالێکتانـە نـە یـەك ئـەگرن [٣] و نـە دەبـێ

---

[٢] زمـانی کـوردی چـەند دیالێکتێکـە و چـەند بەشـە دیالێکتـە ؟ لـەم بارەیـەوە چـەند نەخشـە و بەشکردنمان هەیە تا ئێستا نەخشەکەی زانا تۆفیق وەهبی هـەر لـە جێی خۆیدایە لە هەمووان ڕاستترە . لە باسێکی درێژدا دەربارەی دیالێکتەکانی زمانی کوردی . ڕای تەواو دەربارەی هەموو ئەو دابەشەکردنانە دەرئەبڕێن .

یەك بگرن و نە یەك نەگرتنیان دەبێتە بەڵگەی نەبوونی زمانی یەکگرتووی کوردی . بەڵکو مانەوە و گەشەسەندنیان زمانە یەکگرتووەکەمان و زمانی ئەدەبیی یەکگرتوومان دەوڵەمەند ئەکات .

پرسیار ئێستا دەربارەی (زمانی ئەدەبیی یەکگرتووە) کە ئەمە شتێکی جیاوازە لە (زمانی یەکگرتوو) ، هەندێ کەس لای وایە زمانی ئەدەبی یەکگرتوومان نییە . وا دەزانم زۆرتری شارەزایان ، ئەوەی زانست ئەکەن بە چرای بینین . لەسەر ئەو ڕایەن ، کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستی کردووە بە دروستبوون و ڕێگەی خۆی گرتۆتەبەر و لە گەشەسەندندایە . زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو – شتێك نییە کە ئارەزوی ئەم پاشا یا ئەو زانا دروستی بکات هەروەك شتێکیش نییە کە چەند زانایەك بە پێی نەخشەیەك یا کەتەلۆکێکی ئامادە دروستی بکەن . بەڵکو مێژووی نەتەوە خۆی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دروست ئەکات و هەر نەتەوەیەش ڕێبازی تایبەتی خۆی هەیە لە دروست کردنی زمانی ئەدەبی یەکگرتوودا . ئادەمیزاد دروست کەری مێژووە ، بەلام مێژووی گەلانیش ڕێڕەوێکی هەیە بەرەوپێشەوە کە بە ئادەمیزاد ناگۆڕدرێ . با بۆ ماوەیەکیش کۆسپی بهێنرێتە ڕێگە . لە دروست بوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووشدا ، زانایانی نەتەوەیەك بەوەی کە لە مێژوو ئەگەن و زاناشن دەتوانن (پێش بین)بن و بزانن مێژوو بەرەو کوێ ئەڕوات و ئەوانیش لەگەڵ بەرەوپێش چووندا بن و نەبنە کۆسپی سەرەڕێ .

زانایانی کوردیش دەتوانن لەگەڵ ئەوڕێڕەوەدا بن کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئەم سەدەیەمان لە سەدەی نۆزهەمەوە گرتویەتییە بەرو خێراتر بەرەو پێشەوەی بەرن .

کەواتە دەمێکە زمانی یەکگرتووی کوردی پەیدابووە . کە زمانی کوردییە و خاسیەتی تایبەتی خۆیی لە ڕووی گراماتیك و فۆنەتیك و بنەڕەتی فەرهەنگەوە هەیە و هەموو نەتەوەی کورد بە زمانی خۆیانی دەزانن لەگەڵ ئەوەشدا کە زمانی کوردی چەند

---

[٣] کە دوو جار لە ئەنجامی تێکەڵی و هەندێ ڕووداوی مێژووەوە ڕوو ئەدا کە دیالێکت تێکەڵ بن یا بن بەیەك ، بەلام ئەمە وا ناگەێنێ کە دیالێکت لە زماندا نامێنێ ، بەڵکو لەوانەیە کە لە پاڵ یەکگرتنی دوو دیالێکتدا ، دیالێکتێك دەبێ بەدوو ، یا دووبەش ئەوەندە لە یەك جیادەبنەوە تا دەبن بە دوو دیالێکت .

دیالێکتێکی جیاوازە و هەر دیالێکتە چەند بەشە دیالێکتێکیان لێدەبێتەوە . ئەوەی زانا تۆفیق وەهبی بە ((بێچووە دیالێکت – لهجه))یان دائەنێت . بەڵام خاسیەتە یەکگرتووەکانی ئەو زمانە کوردی‌یە لە هەموو دیالێکت و بەشە دیالێکتەکاندا دەبینرێت . هەریەکە لەم دیالێکت و بەشە دیالێکتانە خاسیەتی جیاوازی خۆی هەیە ، کە لە زمانەکەی جیاناکاتەوە و نایکات بە زمانی جیاواز ، بەڵکو شەقڵی تایبەتی دیالێکت وە بەشە دیالێکتی جیای ئەداتێ و سامانی ووشەی جیاوازی ئەرژێتە ناو زمانە یەکگرتۆکەوە و دەبێتە سەرچاوەی ووشەی هاوجۆر ، کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو سوودی لێدەبینێت و پێی دەوڵەمەند دەبێت . کەواتە دەمێکە گومان لەوەدا نی‌یە کە زمانی یەکگرتووی کوردی هەیە . بەڵام ئەوەی تا ئێستا لەسەردوان و لێکۆڵینەوەی دەوێت . ئەوە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووە.

## زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو :

بەو زمانە دەووترێت ، کەلە زمانی یەگگرتووەوە بە هەموو دیالێکتەکانەوە وەرئەگیرێت ، یا بناغەکەی لە یەکێك لە دیالێکتەکانەوە وەردەگیرێت و زۆرجار پوختە کراوێکی زمانە یەکگرتووەکەیە یا دیالێکتێکی پەتی ، یا بڵێین پوختەکراوێکی زمانی قسەکردنە . ئەم زمانە دەبێتە زمانی نووسین و خوێندنەوە و ئەدەبیات و پشت بە هەموو سەرچاوەکانی بەرەو پێشچوون و دەوڵەمەندبوونی زمان ، دەوڵەمەند دەبێت و بەرەوپێش دەڕوات . زمانی یەکگرتوو و دیالێکتەکانی زمان و ئەدەبی فۆلکلۆری نەتەوە و زمانی نەتەوە دراوسێکان و ئیستیلاحی زانستی جیهانی گەورەترین سەرچاوەی ئەو دەوڵەمەند بوونەن .

زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی گەلان : عەرەب ، فارس ، ئینگلیز ، ڕووس : هەر وەك مێژووی گەلانی جیهان هەمووی چوار چێوەی گشتیی لەیەك دەچێت و مێژووی هەر گەلەش هەندێك خاسیەت و دیمەنی تایبەتیی خۆی هەیە . هەروەها مێژووی پەیدابوونی زمانی یەکگرتوو و زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی گەلانیش چوارچێوەی گشتییان یەکە و هەر زمانەش ڕێبازێکی تایبەتیی دروست بوونی خۆشی هەیە .

گەر زمانی یەکگرتوو – لای زۆر نەتەوەی جیهان – کۆکردنەوەی خاسیەتە لەیەك چووەکانی هەموو دیالێکتەکانی ئەو زمانە بێت . ئەوا زمانی ئەدەبیی

یەکگرتوو – لەپاڵ خاسیەتە یەکگرتووەکانی هەموو زمانەکەدا ، زۆر لە خاسیەتی یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانیشی تێدایە .

چونکە - زمانی ئەدەبیی ئەکگرتوو – لای زۆربەی نەتەوەکانی جیهان ، لەبەر هۆیەك لەیەکێ لە ناوچەکانی وولاتدا دروست دەبێت . هەر لەبەر ئەوەش زوربەی خاسیەتەکانی دیالێکتی ئەو ناوچەیەی تیا دەبێت کە ئەو زمانە ئەدەبیـیە یەکگرتووە ئەوسا لەگەڵ دیالێکتەکانی زماندا بەیەکدا دەچن و جۆرە تێکەڵ بوون ((تفاعل)) ێك لە نێوانیاندا پێك دێت . ئەگەر تەماشای دروست بوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو بکەین ، ئەوا لای نەتەوەیەك تەجروبەیەکی تازە دەبینین .

لای عەرەب – باری ئابووریی مەککە و قورەیش و بێدەرامەتی و ووشك و برنگیی وای کرد کە کوڕانی ((عەبد شەمس)) هەر یەکە ڕێگەیەك بگرنەبەر بۆ ڕزگار بوون لەو بارە ناقۆلایە . بۆیە هەر لە کۆنەوە ((ئومەیە)) کەوتە بازرگانی و ((هاشم)) کەوتە زەیەوانی کەعبە و هەر یەکە لە ڕێبازی خۆیەوە دەرامەتی بۆ تیر و ناوچەکەی خۆی پەیدا دەکرد . بازاری (عوکاز – عکاظ) یەکگرتنێکی ئەم دوو ڕێبازە و جۆرە تەوژمێکی پڕوپاگەندەی ئەو زەمانە بوو بۆ هەردوو ڕێبازەکە . بەم چەشنە لەگەڵ بازاڕی مەکە و بازاڕی بت پەرستیدا ، بازاڕی (عوکازیش) بە شیعر و بە ((شێوەی قورەیش)) کەوتە پڕۆپاگەندە بۆ هەردوو بازاڕ و لەپاڵ هەموو شوێنەوار و تەئسیری دوو بازاڕەکەدا ئاوازی شیعری ((جاهلی)) و هەڵواسراوە هەڵبژاردەکانی دەرگای کەعبەی بە دیالێکتی قورەیش لەناو عەرەبدا جێگیر کرد . گەر تەئسیری (عوکاز) بۆ بڵاوبونەوەی ئەم دیالێکتە لە سنووری تیرەکانی حیجازدا بووبێت . ئەوا قوورئانی پیرۆز و ئاینی ئیسلام بوونە هۆی پەیدابوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی عەرەب . و هەرچەندە لە ((حەوت خوێندنەوە))ی قورئاندا دیالێکتی تیرەکانی عەرەب ڕەچاو دەکرێت . بەڵام قورئانی پیرۆز بە دیالێکتی ئەو کاتەی قوڕەیشە ، کە پێغەمبەر (س) لەوانە بووەو ئاینی ئیسلامیشی لەو ڕێگەیەوە بەوان گەیاندووە و ووردە ووردە وای کرد کە دیالێکتی قورەیش ببێت بە سەرچاوە بۆ ئەو زمانە ئەدەبیـیە یەکگرتووەی ئەمڕۆی عەرەب کە سەردەمێك زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی گەلانی موسوڵمانیش بووەو

دیاره کە ووردە ووردە لە دیالێکتە زۆر و فراوانەکانیتری عەرەبیی تێکەڵ بووە – بەڵام خاسیەتە قورەیشی‌یەکەیی لە دەست نەداوە .

لای فارس – ((خاکی پاکی شیراز)) هەر وەك مەڵبەندی شیعری حافز و نووسینی پەخشانی سەعدی بوو . هەروەها سەرچاوەی بڵاوبونەوەی ئەو زمانە ئەدەبی‌یە یەکگرتووەی ئەمڕۆی فارسە کە تێکەڵی‌یەکی شێوەی شیراز و تارانە . واتە بوونە پایتەختی تاران ((دەسەڵاتی سیاسی)) تێکەڵ بە زمانی ئەدەبیی شیراز بووە و زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی فارسی لێ‌پەیدابوو کە ئێستا هەموو فارس پێی ئەنووسن و دەخوێنن . لە کاتێکدا کە هەر کەسە بە دیالێکتی‌خۆی ئەدوێت .

ئەم تەجروبەیەی فارس لە هەندێك دیمەندا لە دروست بوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئینگلیزی دەچێت . کە ئەویش تێکەڵ بوونی ئەدەبیاتی شیعری ((چۆسەر))ە لەگەڵ شێوەی لەندەن کە شیعری ((شکسپیر)) ڕۆڵی خۆی هەبوو لە بڵاوبوونەوەو داچەسپاندنیدا .

زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ((ڕووسی))ش بە هۆی دەسەڵاتی سیاسی‌یەوە دروست بوو .

لە سەدەی پانزەهەمدا مۆسکو بوو بە پایتەختی دەوڵەتی یەکگرتوو و نووسین و کاروباری ڕەسمی بە هەموو وڵاتدا بە دیالێکتی ئەو ناوچەیە دەهات و دەچوو ، شاعیران ڕوویان کردە پایتەخت و چیرۆکی ڕووسی سەری دەرهێنا و ئەو شێوە بوو بە زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو بۆ هەموو نەتەوەی ڕووس .

**زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی لە مێژوودا :**

زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردیش تەجروبەیەکی تەواو تایبەتی خۆی هەیە . مێژووی ئەدەبیاتی کوردی چەند تەجروبەیەکی پەیدابوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردیمان بۆ دەگێڕێتەوە کە چەند هەنگاو بەرەو پێشەوە چووە. بەڵام ئەو کۆسپ و ناسۆرانەی بەسەر نەتەوەی کورددا هاتوون ، بوونەتە هۆی کزکردن یا مراندنی ئەو تەجروبەیەی کە پاش ماوەیەك یا سەدەیەك لە شوێنێکیتری وڵاتەوە سەری هێناوەتەوە دەردوە.

مێژووی گەلان و مرۆڤایەتی هەمیشە بەرەو پێش ئەڕوات. بەڵام هەندێك ڕووداو لە ژیانی نەتەوەیەکدا ڕووئەدا کە ماوەیەکی زۆر مێژووی پێشکەوتنی ئەو نەتەوەیە دەباتە دواوە بەڵام سروشتی ژیان و مێژوو کە گیانێکی کۆڵنەدەرانە و خەباتکارانەی داوە بە گەلان ، وا دەکات کە ئەو نەتەوەیە پاش ماوەیەك لە ژێرباری سەختی کارەسات دا سەربێنێتەوە دەرەوە و بەرەو پێشەوە بڕواتەوە .

نموونەی ئەم ڕاگرتن و بەرەودوا بردنانەی مێژوو ، هێرشە خوێناویەکانی مەغۆلن ((هۆلاکۆ و تەیموری لەنگ و جەنگیز خان)) بە هەموو کارەساتی خوێنین و کتێب و بەرهەمی بیرسوتاندنێکیانەوە ، هەروەها دوو جەنگە جیهانیەکەی ئەم سەدەیەش لەو ڕووداوانەن . بۆ کوردیش لەم بارەیەوە خانیی مەزن — ئەو ڕاستیەی باش دەربڕیوە کە ووتویەتی :

**ئەڤ قەلزەمی روم و بەحری تاژیك**

**هەندێ کوڕ دکەن خروج و تەحریك**

**کرمانج دبن د خوین مولەتتەخ**

**وان ژێکڤە دکەن میســـــالی بەرزەخ**

بەم جۆرە چەند تەجروبەی پەیدابوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی خڵتانی خوێن کرا . بەڵام پاش چەند سەدەیەك تەجروبەیەکی تازە لە لایکیترەوە سەری هەڵئەدایەوە . تا ئەم تەجروبەیەی ئێستا کە لە سەدەی نۆزدوهەمەوە دەستی پێکردووە و تا ئێستا بەردەوامە و بەرەو پێشەوە ئەڕوات هاتەکایەوە ، تەجروبەی پەیدابوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کورد ، هەرچەندە بەستراوە بە دیمەنێك لە دیمەنەکانی گەشەسەندنی ئەدەبیاتی کوردیەوە . بەڵام ئەدەبیاتی کوردیش هەمیشە بەرەوپێش چوونی پابەندی باری سیاسی و گەشەسەندنی دەسەڵاتی سیاسیی کورد خۆی یا بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی بووە .

گەر لە پەنجەرەی ئەو دیالێکتەوە تەماشای مێژووی ئەدەبیاتمان بکەین کە ئەو ئەدەبەی پێنووسراوە ، یاووردتر ئەوەیە ، کە بڵێین – زۆربەو بەرزترین ئەدەبیاتی سەردەمی پێنووسراوە ، ئەوا چوار هێڵی رۆشن ئەبینین کە چوار سنوورمان پیشان ئەدەن و ئەبنە سنووری یەکێ لەو دیالێکتانەی کە لە سەردەمێکدا بۆتە زمانی یەکگرتووی ئەدەبیات و هەوڵی ئەوەی داوە لە سنووری ئەو ناوچەیە بچێتە دەرەوە . بەڵام ئەو پەل هاویشتنە ، بە زەبری دەسەڵاتی دوژمن و خڵتانی خوێن بوونی کورد گەراوەتە دواوە . گەشە سەندنی ئەدەبیات بە دیالێکتێك بە هیچ جۆرێك لە دەسەڵاتی سیاسیی کورد و بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد جیا ناکرێتەوە بۆ نموونە :

**بەشێوەی لوڕ :**

کۆنترین شاعیری کورد – کە ئێستا کۆمەڵە شیعرێکی ئەوتۆیمان لەبەردەستا بێت – کەناوی (کۆنترین) ی پێ ببەخشێ ، ئەوە بابە تایەری عوریانی هەمەدانییە . کە دوو ساڵی ۹۳۵-۱۰۱۰مێژووی بە ساڵی لە دایك بوون و کۆچی زانراوە .

شیعرەکانی بابەتایەر بە دیالێکتی لوڕیی کوردییە . لەبەرئەوەی مێژووی ئەدەبیاتمان لەو کۆنتر ناوو بەرهەمی شاعیریتری تۆمار نەکردووە . بۆیە ئەبێ ئەوەبسەلمێنین کە دیالێکتی لوڕی یەکەم دیالێکتی کوردییە کە پەلی بۆ ئەوە هاویشتبێ کە بێتە زمانی یەکگرتووی ئەدەبیات لە کوردستاندا.

شیعری بابەتایەر و بە کوردی نووسینی ئەو سەردەمە لە کۆششی گەلانیتری موسوڵمان جیا ناکرێتەوە کە پاش پەیدابوونی میرنشینان و نەمانی دەوڵەتی یەکگرتووی موسوڵمان هەوڵی ئەوەیان دا کە زمانە کۆنەکەی خۆیان بکەنەوە بە زمانی ئەدەبیات و زمانی ڕەسمی نووسین و کاروبار .

هەروەك پەیدابوونی شاعیرێکی کورد لە ناوچەی هەمەدانا لە زروفی مێژووی کاتی خۆی و پەیدابوون و نەمانی میرنشینی لوڕستان جیا ناکرێتەوە.

## کرمانجی ژووروو ( بۆتان ) :

پاش ئەو بەرهەمەی شاعیری لوڕ ، کە تاقە بەرهەمێکی گەورەی ئەو سەردەمە و ئەو دیالێکتەیە لە مێژووی ئەدەبیاتمانا ئەو دیالێکتە دێتە پێشەوە کە ئێستا بە (کرمانجیی ژووروو) ی ناو ئەبەین و (بۆتانی و هەکاری و بادینی و بایەزیدی و ئاشتایی هەریەکە بەشێکن لەو) .

شارەکانی ئەدەبیاتی کرمانجیی ژووروو لە سەدەی شانزەهەم و سەدەی هەڤدەهەمدا هاتوونەتە ناوەوە (چونکە زۆرتری ڕا لەسەر ئەوەیە کە مەلای جزیری و فەقێی تەیران و عەلی هەریری لەو سەدەیەدا ژیاون — خانیی مەزنیش دیارە شاعیری سەدەی حەڤدەهەمە .

بەرهەمی شاعیرانی ئەم دیالێکتە بەشی بۆتانییەکەی کردووە بە بنکەی دەربڕین و هەوڵی ئەوەی داوەکە سوود لە دیالێکتەکانیتری کوردی ببێنێ و زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو لەو کۆمەڵە دیالێکتە و لە تەئسیری ئەدەبیات و ووشەی زمانانی دراوسێ پێك بێنێ .

مەلای جزیری کۆمەڵێ (تەشبیە و ئیستعارە ورازاندنەوەی بەلاغەی) لە ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبییەوە وەرگرتوە و خستوونییە قاڵبی کوردییەوە و لەگەڵ بنکە بۆتانییەکەی خۆیدا تێکەڵی کردوون و زمانی ئەدەبیاتی ئەو سەردەمەی لێ‌پێك هێناون ، بەجۆرێك کە عەلیی هەریری ، لە شاری هەریردا ژیاوە و بەو زمانە شیعری نووسیوە ، کە دیارە لە زمانی ئەو سەردەمەی خەڵکی هەریر نەچووە .

گەر عەلیی هەریری لە بنەڕەتدا خەڵکی شەمدینانیش بێت ، ئەوە لە جەوهەری ئەم بیرەی ئێمە ناگۆڕێت و شاعیرێك لە هەریر شیعر بە زمانێکی ئەدەبی بنووسێ کە مەلای جزیری لە بۆتان پێی نووسیوە ، هەر بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو دیالێکتە پەلی ئەوەی هاویشتووە کە بێتە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو .

خاسیەتی زمانی مەم وزینی ئەحمەدی خانی ، لەوە جیا نییە کە لە شیعری مەلای جزیریدا ئەیبینین .

خانی خۆی ئەم ڕاستییەمان تێ ئەگەیێنێ و بەم جۆرە لەو زمانە ئەدوێ کە مەم و زینی پێنووسیوە :

**کوردی ، عەرەبی ، دەری و تازی**

**تەرکیب کرن بە هەزەل و بازی**

**بوهتی و مەهمەدی و سلیڤی**

**هەن لەعل و هەنەك ژ زێر و زیفی**

وادیارە خانی دیالێکتی کوردی لەو کاتەدا بەم سییانە تێگەیشتووە .

گەشە سەندنی کرمانجیی ژووروو بە تەواوی بەستراوە بە مێژووی پەرەسەندنی دەسەڵاتی میرنشینی بۆتانەوە و لە ڕەگەزەکانی پەیدابوونی بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلی کورد جیا ناکرێتەوە .

خانی لە لووتکەی دەسەڵاتی میرنشینەکەی خۆیدا هاواری یەکێتیی کوردستانی کردووە و ئاواتی بەوە خواستووە کە میرنشینەکان ببنە پاشا نشینێکی یەکگرتووی هەموو کوردستان .

**گەر دی هەبووا مە پادشا هەك**

**لایق بدیا خودێ کولاهەك**

خانیی بلیمەت لەو سەردەمەشدا باوەڕی بە میر و مەزنان نەبووە و کۆمەڵانی خەڵك و ڕۆشن بیرانی بە خاوەنی مەسەلەکە زانیوە و لە زۆر شوێندا ئەم ڕایەی دەربڕیوە .

کە دێتە سەر باسی داگیرکەرانی ڕۆم و عەجەم ئەڵێ :

**تابیعیی وان ئەگەر چی عارە**

**ئەو عارە ل خەڵکی نامدارە**

**نامووسە ل حاکم و ئەمیران**

هەر لەبەر ئەمەشە خانی هەوڵی ئەوەی داوە کە بۆ ئەو کۆمەڵی خەڵك و شاعیر و فەقیرانە بنووسێ و ئەو زمانە ئەدەبی‌یە تێکەڵەی خۆشی کە بنکەکەی بەشە دیالێکتی بۆتانیی کرمانجیی ژووررووە بکات بە زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو کە هەموو شاعیرانی کورد پێی بنووسن . هەر چەندە بۆ خۆی بۆتی نەبووە و خەڵکی بایەزیدە [1] .

بەڵام خەو و ئاواتی خانی لەگەڵ لەناوچوونی میرنشینی بۆتاندا لەناو چوو ، پەل هاویشتنی ئەو زمانە ئەدەبی‌یە یەکگرتووە بۆ هەموو کوردستان سەری نەگرت . هەرچەندە بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی ئەم سەدەیەی کورد چەند جارێك هەوڵدانەکەی زمانە ئەدەبی‌یەکەی مەلای جزیری و ئەحمەدی خانیی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە ناوەوە . بەڵام ئەو هەوڵدانە لەگەڵ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکانی کوردی تورکیا و نەمانی کۆمەڵانی هێڤی و تعالیی کوردستان و خۆیبون دا نەئەما و لەکاتی پەل هاویشتنەکەشیدا ، هەمیشە ئەم سنوورە تازە بابەتە پاسەوانداره دەستکردەی نێوان بەشەکانی کوردستان ، کۆسپێکی گەورە بووە لە ڕێگەی پەرەسەندنیا .

**شێوەی گۆران ( هەورامی ) :**

دیالێکتی سێیەمی کوردی کە پەلی ئەوی هاویشتووە بێتە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو بۆ هەموو کورد . ئەوە دیالێکتی (گۆران) و بە تایبەتی بەشە هەورامی‌یەکەیەتی .

ئەم دیالێکتە ، ڕەنگینتری بەشی ئەدەبیاتی کورد و سامانی نەتەوەیی‌مان نووسراوە و ئەدەبیاتی ئەم دیالێکتە هەندێ خاسیەتی ئەوتۆی خۆیی لە ئەدەبیاتی نەتەوەکەماندا داچەسپاندووە کە تەواو لەگەڵ خاسیەتەکانی زمانی کوردیدا دەگونجێ . بە جۆرێکی ئەوتۆ کە پاش کشانەوەی ئەم دیالێکتە خۆیشی ، ئەو خاسیەتە داچەسپاوانە لە ئەدەبیاتی کوردیدا ماوەتەوە و کاری کردۆتە سەر ئەو زمانە ئەدەبی‌یە یەکگرتووەی ئومڕۆ ئەدەبیاتی ئەم سەردەمە پێ دەنووسرێ. نموونەی ئەمەش کێشی

---

[1] بایەزید یەکێکە لە پێنج بەشە دیالێکتی کرمانجی ژووروو (بۆتانی – هەکاری – بایەزیدی – ئاشتایی – بادینانی) .

پەنچەی شیعری کوردییە کە ئەمڕۆ باڵی بەسەر بەرهەمی زوربەی شاعیرانماندا کێشاوە .

گەشەسەندنی شیعری هەورامی دیالێکتی گۆران بە تێکڕایی لە بنەڕەت و هێڵی بەرەو پێش چوونیا لە گەشەسەندنی دیالێکتەکانی تر ناچێ .

دەسەڵاتی سیاسی (لەم جۆرە گەشە سەندنە جیا ناکرێتەوە ، بەڵام تەنیا بۆ ئەم دیالێکتەی کوردی ، ڕەنگە ئایین و مەزهەب و تەریقەت هۆیەکی بنەڕەتیی گەشەسەندنی ئەم دیالێکتە بن) .

گەلێك بەراورد تا ئێستا لە نێوان گاتاکانی زەردەشت و شیعری هەورامیدا کراوە ، بەتایبەتی لە ڕووی کێشی ئەو شیعرانەوە . پیری شالیاری هەورامی لای هەندێك بە یەکێك لە موغەکانی زەردەشت دەناسرێ و هەندێکیش بە پیاوێکی گەورەی سەرەتای بڵاووبونەوەی موسوڵمانێتی دەزانن لە کوردستانا . گۆرانیی مەزهەبی گۆرانەکان و شیعری ئایینیی ئەهلی حەق بەم شێوەیە نووسراون .

مامۆستا عەلائەدین سەجادی لای وایە کە مەولەوی هەر لەبەر ئاڵودەیی شێخی سیراجەدین و تەریقەتی نەقشبەندی شیعری بە هەورامی نووسیوە . بەڵام گەر ئەم ئاڵودەییەش هۆیەك بێت ، ئەوا دەروون پڕبوونی مەولەویی تاوەگۆزی لە وێنە و ووشەی چەند سەدەی شیعری گۆران و ناسینی ئەو دیالێکتە بە زمانی ئەدەبیات وای لەویش و لە مەولانا خالیدی مکایلیی جافیش کردووە کە بە هەورامی شیعر بڵێن .

هەوڵدانی دیالێکتی گۆران و پەل هاویشتنی بۆ ئەوەی کە ببێ بە زمانی یەکگرتووی ئەدەبیات ، لە کاتی گەشەسەندنی کرمانجیی ژووروووەوە دەستی پێکردوە و ، هەر لەو کاتەشدا کە لە پایتەختی میرنشینی باباندا شتێکی تازە پەیدادەبوو کە ئێستا گەشە دەسێنێ ، هەر لەو کاتەشدا هێشتا مەولەوی بەو دیالێکتە شیعری دەووت . بەڵام وەك خانی لووتکەی کرمانجیی ژووروو و نوقتەی هاتنە خوارەوەی بوو ، هەروەها مەولەویش لووتکەی شیعری هەورامی و نوقتەی هاتنە خوارەوەیەتی .

لـه سـەدەی هەژدەهەمـەوە و لـە دامەزرانـدنی شـاری سـلێمانی‌یەوە بەشـە دیالێکتێکی تـر پـەلی ئـەوەی هاویشت کە ببێتـە زمانی ئـەدەبیی یـەکگرتوو ، ئەمـەش بەشی سلێمانیی کرمانجی خواروەوە .

## کرمانجی خواروو :

کە دێینە سەر ئەو زمانە ئەدەبی‌یەی ئێستا کوردیی پێ‌دەنووسرێ و سەرەتاکەی لـە بەشـە شێوەی (سلێمانی) ی کرمانجیی خـوارووەوە دەسـتی[٢٨] پـێ کـردووە و گـەلێك ناوچـەی گرتۆتـەوە ، دەبـێ پـێش هـەموو شـتێك چـەند تـێبینی بەرامبـەر بەشـاری سـلێمانی بنووسـین ، کـە بـە داخـەوە هەنـدێ کـوردی کۆلکـە خوێنـدەوار لـە هـۆی ڕاستەقینەی پێش کەوتنی ئەو شارە ناگەن و دەیانـەوێ بـە زۆر جـۆری چـەوت و دوور لە زانستەوە لێکی بدەنەوە و هەوڵی ئەوە بدەن کە ببنە کۆسپێك لەبەردەمی ئەو پێش کەوتنـەدا ، هـەر وەك وەسـتاندنی ئـەو پێشـکەوتنە کـە زروفـی مێـژوویی و مـەوزوعی دروستی کردووە سوودی کوردی تیابێ و جۆرە عەدالەتێك لە پێش کەوتنی کوردستاندا پێـك بێنـێ کـە لـە ڕاسـتی‌یا گـەر ئـەوپێش کەوتنـە بوەسـتێنرێ ئـەوا عەدالـەت لـە دواخستنی هەموو کورددا پێك دێ نەك پێش کەوتن .

## شاری سلێمانی :

تەنیا ئەوانەی مێژوو بە ئـەنجامی ئارەزوو و خواسـتی تاقـە کەسێك یـا چـەند کەسێك دادەنێن ، دروسـت کردنـی شـاری سـلێمانی بـە ئـەنجامی ئارەزوویـەکی بـرایم پاشـای بابـان و ئالودەیی ئەو پاشایە لەگەڵ چاوی ڕەشـی ئاسـکی کانێسـکاندا دەزانـن. بـەڵام ڕاسـتی مێـژوو ئـەوەمان پێ‌دەڵـێ کـە پێویسـتی‌یەکی مـەوزوعی وای کـرد کـە لـە ئـەنجامی پەرەسـەندنی مێـژوویی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووریی میرنشـینی بابانـدا پێویسـت بـە شـارێکی گـەورە و پێشکەوتوو هـەبێ کـە ببـێ بـە پایتـەختی ئـەو میرنشینەی دەیویست پەرەبسێنێ و پـەل بـۆ میرنشینەکانیتری کـورد بهاوێـژێ و ئـەو ئاواتـەی بهێنێتـە دی کـە بـۆ میرانـی بۆتـان و سۆران نەهاتەدی — ئاواتی یەك خستنی کوردستان . باری جوغرافی و کۆمەڵایـەتیی شاری قەڵاچوالان لەوەدا نەبوو کە ئەو پایتەختەی لێ پەیدابێت . بۆیە هەر لەو نزیکـە شوێنی ئێستای سلێمانی لە هەموو ڕوویەکەوە لێی دەهات کە ئەو پایتەختەی تێدا دروست بکرێ. بناغەدانـەوەی شاری سلێمانی لـە سـاڵی ١٧٨٤ دا ئـەنجامێکی تەجروبـەی چـەند سـەدەی کوردیشـە لـە شـار دروست

کردندا و دنیا دیدهیی پادشای بابان خۆیشی لە نەخشەکێشان و بیناکردنی شاردا جێگەی خۆی گرت .

هەموو شارێکی تازە لە مێژوودا ، بە تایبەتی ئەو شارانەی لە سەردەمی شارستانێتیی تازە و بەرەو پەیدابوونی پەیوەندیی سەرمایەداری چوون لە بەرهەمدا دروستکراون ، هەموو ئەنجامێکی پێش کەوتنی ئەو چەند سەدەیە لەوێدا دادەچەسپێنن و دواکەوتنەکەی ئەو چەند سەدەیە لە دەرەوەی شار جێدێڵن.

بەم چەشنە لە شاری سلێمانیدا هەر لە سەرەتای دروست بوونیدا گەلێك شت پێك هات . شار لەسەر بناغەی زانین و شارستانێتی دروست کرا. بە چەشنێك کە لە شاری تازەی پێشکەوتوو بچێت و هونەری ئەرخیتێکچەری ئەو سەردەمەی ڕۆژهەڵاتی تێدا بەکارهێنرا [1] .

هەر لە سەرەتای دامەزراندنییەوە پرۆژەی ئاوو [2] زێرابی تایبەتی بۆ هەموو شارەکە کرا .

---

(١) میستەر ڕیچ و مێجەرسۆن . لە باسی سلێمانیدا شتی جیاواز دەگێڕنەوە . ڕیچ لە دەوری بابان دا چۆتە سلێمانی و ئومێدی بەوەبووە کە بابان بەرامبەر بە تورك ڕاست کاتەوە بۆیە لە جوانی سلیبمانی دەدوێ. سۆن لە شێخانی سلێمانی نا ئومێدبووە. لەبەرئەمە تەنانەت خانوو گوێسەبانەی سلێمانیشی لا ناڕێکەو بە هیوای ئەوە بوو هەڵەبجە ئاواتی بهێنێتە دی . بۆیە باسی لە جوانی و ڕێکوپێکی شاری هەڵەبجە زیاتر دەکات . ڕای ئەم نێراوانەی ئیمپریالیزم هەرچییەك بێت . پاشماوەی دەوری بابان و خانوە کۆنەکانی سلێمانی بەڵگەی ووتەمانن .

(٢) تا ئەم ساڵانەی دوایی لە سلێمانی ئاو لەو کارێزانە دەخورایەوە کە بە ژێر زەویدا بە هەموو ماڵی گەڕەکدا دەڕویشت و لە شێوەیەك دا بوو کە زۆر پایتەختی گەورەی ڕۆژهەڵات ، تا ئەم ساڵانە هەر ئەو چەشنە پرۆژەیەیان هەبوو .

بۆ (زێراب)یش ئەو شیوانەی لە سلێمانی ڕێك خرابوو و ئێستا داپۆشراون هەر ئەوەی کۆنن . تەواو لەو پرۆژەی زێراب (مجاری)یانە دەچن کە تازە لە شوێنێکی وەك بەغدادا دروست دەکرێ .

چەند چەشنە پیشەسازی لە شارەکەدا دەمەزرا ، کە لەو پیشەسازی‌یانە دەچوون کەوا لە سەرەتای ڕاپەڕینی پیشەسازی و پەیدابوونی پێوەندیی بۆرژوازیی ئەوروپا دا پەیدابووبوون . وەك سابوون دروست کردن و [3] چنین و ڕستن و جۆلایی و موتابخانە[4] و دەباخانە [5] . هەر وەك گەلێ سنعەت کاریتر لە شاردا پەیدابوون ،وەك چەخماخساز و کارگەچی ... هتد وە زۆری ئەم سنعەتانە کاری تاقە کەسی یا تاقە وەستا نەبوون . بەڵکو زۆرتر ئەوە بوو کە وەستایەك چەند شاگردی لەناو چوار دیواردا کۆدەکردەوە و ئیشی پێدەکردن . کە ئەمە لە ئیکۆنۆمی‌دا بە (مانیفاکتۆرە) دەزانرێ ، کە یەکەم وێنەی کارگەی تازەی دەوری سەرمایەداری‌یەو یەکەم دەستگایە کە شێوەی (بە کۆمەڵ بەرهەم هێنان) بدا بە بەرهەم ، کە ئەمە خاسیەتی یەکەمی ڕژێمی سەرمایەداری‌یەو ئەو هەنگاوەیە کە ڕژێمی سەرمایەداری بە سۆشیالیزمەوە دەبەستێ . هەر وەك پیشەسازی لە یەکەم ڕۆژەوە لە سلێمانی‌دا سەری دەردەهێنا . هەروەها ئەو شارە بوو بە مەرکەزێکی پتەوی بازرگانیش .

بێگومان ئەم پێشکەوتنە ئابووری‌یەو ئەو هەوڵە سیاسی‌یە پێشکەوتنی زانیاری و ئەدەبیاتیشی لێدەبێتەوە و چەشنە وریایی و هۆشیاری‌یەك لە ناو دانیشتووانیشدا دروست دەکات . بە تایبەتی گەر ئەوەش بزانین ، کە سەرچاوەکانی مێژوو دەیگێڕنەوە : کەوا پاشای بابان کاتێ شاری دروست کرد هەواڵی بۆ هەموو دێهات و سەرتیرەکان نارد کە هەر لایە چەند ماڵ بنێرن بۆ ئەوەی لەم شارە تازەیەدا نیشتەجێ ببن . دیارە کە هەر گوندە و هەر سەرتیرەیە ئەو کەس و خێزانانەیان ناردە شار ، کە حەزیان لە

---

[3] لە سلێمانی تا ئێستا گەڕەکێك هەیە پێی دەبێژرێ سابونکەران و تا ساڵانی دوایی هەموو ماڵانی ئەو گەڕەکە سابوونیان دروست دەکرد . سابوون هەروەك لە ڕیزی پەیدابوونی پیشەسازیدا دەژمێررێ ، نیشانەی بڵاوبوونەوەی پاك و تەمیزی و شارستانیەتە .

[4] موتابخانە : ئەو جێگەیەیە کە خەراری تیا دروست دەکرێ ، خەرار دروست کردن بە زۆری هەر وەك پیشەسازی‌یە . هەروەها پلەیەکیشە بۆ بەستنی بەرهەمی گوند بە شارەوە ، واتە بە بازاڕەوە ، کە ئەمەش لە ئابوریدا هەنگاوێکی تازەی پێش کەوتنی کۆمەڵە .

[5] دەباخانە : دەباغ خانە : پێستی تیا چاك دەکرێ . چ بۆ ڕەوانە کردن و تیجارەت پێکردن و چ بۆ پێڵاو دروست کردن کە ئەویش پیشەسازی‌یەکی خۆماڵیە .

ژیانی شارستان و پێشکەوتن دەکرد و لەگەڵ ئەو ژیانـەدا دەگونجان وەك دەڵێن شایانی ئەوەبوون ڕوووی خۆیان و تیرە و گوندەکەیان لە بەرهەمی پاشادا سپی‌بکەن.

ڕاستی‌یەکی عیلمیی ئەوتۆش هەیە کە لێرەدا هاتەدی . ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە هۆشیارترین دەستەی جوتیار ڕوودەکەنـە شار ، ئەوانـەی بتـوانن لەگـەڵ ژیـان و ڕێـك وپێکی ئیش کردن و گوزەرانی کرێکاردا بگونجێن [٦] .

گـەر ئەمـە لـە باسـی زەحمەتکێشانی شـاردا ڕاسـت بێـت ، ئـەوا بـۆ سـنعەتکار و بازرگان و توجاریش دەبێتە شتێك کە ڕووی‌داوە . زۆر لە پیاوە پیرەکانی سلێمانی و لـە خێزانە کۆنەکانی باش ئەوە دەزانن کە هەریەکەیان لـە کوێـوە هـاتوون و بـۆچ ؟ . هـەر سـنعەتکارێکی کـوردی دەسـت ڕەنگـین کـە سـنووری گونـد و شـارەکەی خـۆی پێ‌تـەنگ بووبـێ . هـاتووە لێـرەدا هونـەری خـۆی بنوێنـێ و پـێش بکـەوێ . سـلێمانی بـوو بـە مەرکەزێك کـە خـاوەن پـارەی زۆر شـوێن بـەو جێگەیـەی بـزانن کـە سـەرمایەکەیان بـە ئازادی پەرەی تیابسێنێ . بۆیە لە کوردی هەمەدان و لە ئازربایجانی و جولەکە و کلـدان ڕوویان کردە سـلێمانی [٧]تەنانـەت لـە تۆمـاری یادگـارا باسـی زۆر مۆسـیقاژەن و گـۆرانی بێژیش هەیە کە بەم مەبەسە ڕوویان کردە سلێمانی .

لە ڕووی زانست و خوێندەواریشەوە هەر لە سـەرەتاوە چـەند مزگـەوت دروسـتکرا و مزگەوتی گەورە بوو بە مەڵبەندی خوێندن و بە سەرپەرشتیی پاشای بابان و لە پـارەی میرنشـینی ڕێ و شـوێن بـۆ گـوزەرانی سـەدان فـەقێ دانـرا ، کەلـە هـەموو کـونجێکی کوردستانەوە دەهاتن.

فەقێی زانست خواز و زیرەك بۆ خوێندن ، مـەلای لێ‌هـاتوو و هەڵکـەوتوو بـۆ دەرس ووتنەوە ڕوویان کردە ئەو مەڵبەندە . دیسان ئەوەش ئاشکرایە کە ئەو مەلا گەورانە لـە

---

[٦] ئـەم دەسـتەیە لـەناو فەللاحـدا بـە دەسـتەیەکی پـێش کـەوتوو و هۆشـیار دەزانـرێن . بـەڵام لـە وولاتانی پێش کەوتوودا . کە چینێکی کرێکاری پتەو و کۆنی تیایە . بـە دەسـتەیەکی تـازە و تـا ڕادەیەك دواکەوتوو دەناسرێن . کە هۆشیاری و ڕێك و پێکی کرێکاران شاش دەکەن .

[٧] مێجەرسۆن هەوڵی ئەوەی داوە زۆر ناپەسندانە ئەم تێکەڵی‌یەی خەڵکی سلێمانی لێك بداتـەوە . بە چەشنێك کە بە سووکی تەماشای ئەو شارە نەبەزە بکرێت . جێی داخە کە هەندێ کورد ئـەو ووتە ناشرینانەی ئەو دووبارە بکەنەوە .

کوێوه هاتن و بۆچ ؟ وه چۆن هەندێکیان لە سلێمانیدا پێگەیشتن و بە ناو هەموو وڵاتانی ئیسلامدا ناوبانگیان بڵاوبۆوە هەر لەم بارەیەوە کێشەی نێوان تەریقەتی قادری و نەقشبەندی بە شقڵێکی پێش کەوتنی شار دەزانرێ[٨] .

قوتابخانەی ئەدەبیی نوێ :

بێگومان لەم زەوییە بە پیتەدا و لەم مەیدانە پێش کەوتووەدا ، بزوتنەوەیەکی ئەدەبیی تازەش بەرپا دەبێ و پێڕەوێکی تازە یا چەند پێڕوە و دێتە کایەوە .

گزنگ و مەشخەڵی پێڕەوێکی ئەدەبی تازە لە سلێمانی یەوە سەری کوردستانی گرتەوە . یا ڕاستتر ئەوەیە (کەلە ڕووی زمانەوە) بوو بە ئەدەبیاتی ئەوانەی بە سێ دیالێکتی کوردی دەدوێن .

قوتابخانەی شیعری بابان ، کە هەندێ لە مێژوو نووسانی ئەدەب بە قوتابخانەی نالیی دادەنێن و هەندێکیش لە باسیدا ناوی نالی و سالم و کوردی پێکەوە تۆمار دەکەن . ئەو قوتابخانەیە گەر لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە گەلێك دیمەنی لە ئەدەبیاتی ئەمڕۆماندا نەمابێ . ئەوا فۆڕمی ئەدەبیاتی ئەمڕۆمان هەر بەرەو پێشچوونی مێژوویی فۆڕمی ئەدەبیی ئەو قوتابخانەیەیە ، بە تایبەتی ئەو زمانەی کە ئەدەبیاتەکەی پێدەنووسرێ هەر ئەو زمانە ، تازە پتەوەیە کە بە هۆی دارشتنی فۆڕمی تایبەتیی خۆی . گەر گۆڕانێکیش لە زمانی ئەدەبیاتی ئەمڕۆمان و ئەو قوتابخانەیەدا ببینین ، ئەوە هەر ئەو گۆررانەیە کە مێژوو و سروشتی پێشکەوتن دروستیکردووە و دەبێ ڕوویدا و سەرچاوەی یەکەمی ئەو پێشکەوتن و بەرەو پێش چونەشی لە زمانی ئەدەبیاتی ئەمڕۆماندا هەر ئەو ڕۆشنی و تازەگەری و دینامیکێتی‌یەیە کە لە زمانی ئەدەبیاتی دەوری باباندا هەبوو و دەستی پێکرد .

---

[٨] تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی عیلمیی ئەم کێشەیەمان نی‌یە کە مەسەلەکە ببەستێ بە ژیانی سیاسی و ئابووریی کوردەواری و بە پلەی ئەوسای کوردایەتی‌یەوە . تا ئێستاش لێکۆڵینەوەی ڕاستەقینەی ژیان و بیر و بزوتنەوەی ئەو ڕابەر و ڕۆشن بیرەی کورد پشت گوێ خراوە ، کە بە شاهیدێکی گەورەی بیروباوەڕ دەژمێررێ مەبەس مەولانا خالیدی نەقشبەندی‌یە . کە بە زۆر ئاوارە و دەربەدەر کراو لە دوور وڵات بە ڕشانەوە کۆچی کرد (١٢٤٢هـ) .

ئەو زمانە کوردیـیەی ، یا ووردتـر ئـەوە بێـژین ئـەو دیالێکتـە کوردیـیەی لـە سـەرەتاوە شیعری نالی و سالم و کوردیی پێ نووسرا ، تەواو ئەو دیالێکتە نەبوو کە خـەڵکی سلێمانی پێـی دەپەیڤن . بەڵکو هەر وەك خەڵکی سلێمانی خۆیـان تێکەڵ بـوون و گـەر شـێوەی قسەکردنیان تەئسیری چەند دیالێکتی جیاوازی کوردیشی تیـا دیـار نـەبووبێ . ئـەوا چـەند بەشـە دیـالێکتێ هەر کاری تێ کردووە . هەروەها ئەم تێکەڵی‌یە لە زمانە ئەدەبی‌یەکەشدا هەر دیاربوو.

هونەرمەندی و وەسـتایی دامەزرێنـەرانی ئـەو قوتابخانـە ئـەدەبی‌یـە ، توانایـەکی وای بەخشی بـە ئـەدەبەکـەیان ، کـە زوو بڵاوبێتـەوە و بـاش بچێتە دڵەوە و کـار بکاتـە سەر شاعیرانی ناوچەیتری کوردستان و ئەو دەنگەی لە سلێمانی‌یەوە بـەرزبۆوە ، دەنگـی دایەوە و دەنگ دانەوەکەشی لە یەکەم پلەدا لە ناوچەی سۆرانەوە [٩] بوو .

هەر لەو سـەردەمەدا شیعری حـاجی قـادری کۆیی (١٨١٥-١٨٩٧) و ئەختـەر (١٨٣٦-١٨٨٦) و کەیفی جوانڕیی لە خاکی سۆرانەوە و مەجدی (١٨٤٩-١٩٢٥) لـە ئەردەڵانـەوە و کۆمەڵێ شاعیریتری ناوچەی سنە و موکریان هـەر بـەو چەشنەیان نووسـیوە کـە نـالی و هاوەڵەکانی نووسیویانە . واتە : پشت بە گـەلێك بەڵگـەی ئـەدەبی دەتـوانین بڵێین ئـەو زمانە ئەدەبی‌یـەی لـە سلێمانی‌یەوە هـەڵقوڵا هـەر لـە سـەرەتای دروسـت بوونیا زمـانی ئەدەبیی هـەر چوار بەشـە دیالێکتەکـەی کرمـانجیی خـواروو بـوون . واتـە : سلێمانی و سنە و سۆران و موکریان . ئەوساش و ئێستاش لە ئاخافتنی ڕۆژانەیاندا ئەوەندە جیـان کە هەریەکێ لەوان ناوبنێن بەشە (دیالێکت) ، بەڵام ئەوساش و ئێستاش هـەر بـە یـەك زمان و یەك چەشن نووسیویانە .

گەر بـاری سیاسیی لوڕسـتان و لەناوچوونی میرنشینی بۆتـان و پـاش ئـەوەش هێرشـی جانەوەرانـەی کەمالی‌یـەکان وای کردبـێ کـە مەشـخەڵی شیعری بابەتایـەر و شـیعری کرمـانجی ژووروو ، یا بڵێین ئەدەبیاتی بۆتان کزبێت ، یا لەناوبچێ و تەوژمی شیعری بابان وای کردبێ کە زۆر لەوانـەی هـەورامی نـەبوون و بـە هـەورامی شـیعریان دەووت ، یـا تەنانـەت خوێنـدەوارانی هەورامانیش ئەم شێوە تازەیـەی نووسـین بـە شـێوەی ڕەسمیـی ئـەدەبیات بناسـن و هـەورامی

---

[٩] تا ئێستا زۆر نوسەر بە هەڵە بە هەموو (کرمانجی خواروو) دەڵێن (سۆرانی) ، کـە سۆران هـەر بە ناوچەی میرنشینی سۆران دەووترێ و شێوەکەی بەشێکە لە چواربەشی دیـالێکتی کرمـانجیی خواروو ، واتە ( سلێمانی ، سنە ، موکریان ، سۆران ) .

بەجێ بێڵن . ئەوا مەشخەڵی شیعری بابان نەهاتە کزی و جاروبار هەر گەشەی دەسەند و هەر پێش دەکەوت و گەر جاروبار کپ بوو بێ ، ئەوا هەر ماوەو ڕێگەی خۆی نەگۆڕیوە و ڕووداوی کۆمەڵایەتی و سیاسی جاروبار گیانێکی تازەی کردووە بە بەردا.

**داگیرکردنی عوسمانی :**

نزیکیی خاکی بۆتان و تەنانەت بادینانیش وای کردووە کە دەسەڵاتی تورك یەکسەر بگاتە هەمووو کونجێکی ژیانی ئەو دوو میرنشینە پێشووەی کورد .

داگیرکردنی عوسمانی لە فەرهەنگی سیاسەتدا بەرامبەر بە نەزانی و نەخۆشی و دواکەوتنە . بەم جۆرە لە هەموو خاکی داگیرکراوی کورددا ، عوسمانییەکان دەستیان دایە کوژاندنەوەی هەموو مەشخەڵ و چرایەکی زانیاری . لە جزیرەو ئامێدی و ئاکرێ و شووش و باڵەتە و سلێمانی و گەلێ شوێنی ئەدەبیات بوون . بەڵام داگیرکەری عوسمانی ئەو مەشخەڵەی فەمراند و گەر بۆ خاپاندن و دەسەڵات پتەوکردنی خۆیان کاریان بە ئاین و مزگەوت بووبێ. ئەوە هەوڵی ئەوەیان داوە کە لەجێگەی دەنگی موناقەشە و زانین ، دەنگی دەف و لە جێگەی چرای زانست بریسکەی شیر و زرکی دەرویشی تێدا جێگیر بێت.

ناوچەی سلێمانی ، هەرچەندە زۆر کارەساتی دی کە بێتە هۆی دواکەوتن و ڕاگرتنی بەرەو پێش چوونەکەی دەوری بابان . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ هۆ هەبوو کە ئەو مەشخەڵەی لە کوژاندنەوە ڕزگارکرد .

دووریی سلێمانی لە پایتەختەوە و بە زەحمەت گەیشتنی سوپا و سەربازی عوسمانی [1] ، وایکردبوو کە هیچ کاتێك لە سلێمانیدا دەسەڵاتێکی پتەوی عوسمانی دیار نەبێت .

گەر شێخی نۆدێ لە دەوری بابان دا بە یەکی لە کۆڵەکەکانی زانست بزانرێ . ئەوا کاك ئەحمەدیش لەم دەورەدا بەوەی تەریقەت و زانینی لەیەك دا ، وایکرد کە ئەو

[1] لەم بارەیەوە یادداشتەکەی مێجەرسۆن گەلێك شتی سەیر دەگێڕنەوە . تەنانەت سەربازی عوسمانی لە ترسی هەمەوەند هەر نەیتوانیوە ڕێگەی سلێمانی بگرێت و زۆر بە زەحمەت گەیشتۆتە ئەوێ .

مەشخەڵە نەکوژێتەوە . تەنانەت بەڵگە زۆرە کە پاش ڕوخاندنی بابانیش هەر بە کوردی دەرسی دەووتەوە . عوسمانیەکان – بۆ بەڕێوە بردنی دەستگای دەوڵەت پێویستیان بە چەند قوتابخانە هەبوو ، کە کادر و فەرمانڕەوایان بۆ پێبگەیەنێت . بۆ ئەوەش کە خەڵکی هەندێ لای ئیمپراتۆریەتەکەش بە چەند دەستگایەکی ئەوتۆ بێدەنگ بکەن کە خۆشیان سودی لێببینن – لە پاڵ دانشگای سوڵتانی و عەسکەریی ئەستەمبوڵدا لە چوار شاری ئیمپراتۆریەتدا چوار قوتابخانەی ڕوشدیەی عەسکەری‌یان کردەوە . کە بۆ ئەو کاتە لە ڕیزی پلەی سانەویی خوێندنی ئەمڕۆدا دەژمێررا ، هەرچەندە ڕادەی خوێندنەکەی زۆر لەوە بەرزتربووە . یەکێ لەم چوار ڕوشدیەی عەسکەری‌یە بەر شاری سلێمانی کەوت [٢] .

ئەم قوتابخانەیە ، هەر وەك پێشکەوتنەکانی پێشووی دەپاراست ، هەروەها بناغەی خوێندنی هاودەم و تاز بابەتیشی یەکەم جار لە سلێمانی‌دا بەڵکو لە هەموو کوردستاندا دامەزراند و هەر لێرەدا کۆمەڵێ قوتابی پێگەیشتن کە دوایی ڕوویان کردە ئەستەموڵ و خوێندنیان تەواو کرد و زۆریان لەمەودوا بوون بە کەسی وا کە لە مێژووی سیاسی و کەڵچەر و ئەدەبیات و زمانەوانی و مێژوونوسینەوەی کورددا ناویان بدرەوشێتەوە . هەروەك کاربەدەستی وایان تیا هەڵکەوت کە لە ئەستەمووڵدا پایەی زۆر بڵندی هەبێ و لە ڕووی شارستانی و کەڵچەرەوە هەوڵی ئەوە بدات گەر خزمەتی هەموو کوردستانیشی پێ نەکرێ ، ئەوا خزمەتی سلێمانی بکات.

### داگیرکردنی ئینگلیز :

ئەوەی دەربارەی داگیرکەری عوسمانی دەووترێ ، دەربارەی داگیرکەری ئینگلیزیش ڕاستە . دەسەڵاتی ئیمپریالیزمی ئینگلیز هەر لە ڕۆژی خۆیەوە تا ئەمڕۆش یەکەم سەرچاوەی ماتەم و کارەسات و دابەش کردن و دواکەوتنی کوردستانە .

بەڵام ڕێکەوتێکی سەیری مێژوو وایکرد کە یەکێ لە کۆڵەکەکانی ئەم ناوەی ئیمپریالیزمی ئینگلیز کە مێجەر سۆنە ، لە پاڵ ئەو هەموو دوژمنایەتی‌یەدا کە لەگەڵ

[٢] ئەم چوار قوتابخانەیە لە ئیزمیر و شام و بەغدا و سلێمانی بوون .

کوردی کردو لە پاڵ ئەوەدا کە مێژوو بە یەکەم دوژمنی سەرداری نەتەوەی کورد و ڕابەری دەیان ساڵی خەباتی شێخ مەحموودی حەفیدی دەزانێ ، هەندێ خزمەتی زمانی کوردیش بکات و لە دەوری ئەوەدا ئەو تەوژمی ئەدەبیات و زمان پوختە کردنەی دەوری بابان بەرەو پێشەوە بڕوات [٣] .

**فەرمانڕەوایی شێخ مەحموود :**

ئەم تەوژم و پێشکەوتنە کالآی ماندویی ساڵی ١٩٢٢ دا کردەوەو پشتێنی بە ئاسوودەیی ڕۆیشتنی تا ماوەیەك لێبەست .

ساڵی ١٩٢٢ لە مێژووی کورددا سەرباسێکی زێرینە . گەر لە مێژووودا ئەو ساڵە بێت کە لە ناوچەیەکی کوردستانا یەکەم قەوارەی تازە بابەتی کورد دامەزرا و شێخ مەحموودی پێشەوا بە ڕەسمی بە مەلیك مەحموودی یەکەم . ئەوا بۆ ڕۆشن بیری و خوێندەواری و کەلچەری کوردی ، بە ساڵی ڕەسمیی لەدایك بوون دەژمێردرێ و لەو ساڵەدا ئاواتەکەی خانی هاتەدی و زمانی کوردی بە ڕەسمی ناسراو وەك ئەو دەیفەرموو : (( نەقدێ مە بوو بە سکەی مەسکووك )) . لە ڕۆژانی پاشایەتیی شێخ مەحموودا زمانی کوردی بە ڕەسمی بوو بە زمانی دائیرە و دەستگای دەوڵەت و قوتابخانە . هەر (شێخ) لە دەست بەسەری هیندستانەوە گەڕایەوە پایتەختەکەی. قوتابیی کورد یەکەم سرووودی خۆیان بە کوردی بۆ ووت[٤] . یەکەمجار بوو لە مێژووی قوتابخانەی تازە و هاودەمدا زمانی کوردی زمانی ڕەسمی بێت .

ڕۆژنامەگەریی کوردی لەم دەورەدا چالاکانە پەرەی سەند ، شیعر و ئەدەبیات بوو بە چەکی پاراستنی شۆڕش و ئەو قەوارەیەی کورد . ئەو زمانەش کە لە هەموو ئەم کەین و بەینەدا بەکاردەهێنرا هەر ئەو شێوە کوردیە بوو کە لە ڕۆژانی نالیدا دەستی پێکردبوو و لە دەوری هەردوو داگیرکەردا پەرەیسەند .

---

[٣] لەم بارەیەوە تەماشای ئەوە بکە کە نووسەری ئەم نامەیە لە حوزەیرانی ١٩٧٠ دا لە (التآخی) دا بە ئیمزای (ع) نووسیویە .

[٤] ڕەفیق حیلمی لە یادداشت دا باسی ئەو سروودە دەکات کە شاعیری ناودار زێوەر لەبەروپیرچونی شێخ دا بۆ قوتابیانی نووسیبوو .

## دەوڵەتی عێراق :

پاش ئەوەی جارێکیتر داگیرکەر هاتەوە و (شارەزوور بۆوە بە دەریای خوێن و سلێمانی گەمییە ڕەنگ) و دەسەڵاتی شێخ مەحموود پاش نزیکەی ساڵێك لەناودرا و ناوچەی سلێمانی کرا بە لیوایەکی مەملەکەتی عیراق کە تازە فەیسەڵی یەکەم هێنرابوو و کرابوو بە مەلیکی .

پاش ئەوەش لە ناوچەی سلێمانیدا خوێندن و زۆر کات کاروباری ڕەسمیی دەستگاکانی دەوڵەت بە کوردی هێڵرایەوە .

لەو ساوەو تا ئێستا شەش پۆلی سەرەتایی بە کوردی دەخوێنرێ .ڕۆژنامە و گۆڤار و کتێبی کوردی لەم ناوچەیە هەر نەبڕاوە . فراوانبوون و پەرەسەندنی یا کەم بوونەوەو کزبوونی بەستراوە بە تیژبوون و هێواش بوونەوەی هێرشی ڕژێمی کۆنەپەرستیی ئەو سەردەمانەوە . بەڵام بە هیچ جۆرێك تا ساڵی ١٩٦١ ساڵێك ڕانەبوردووە کە ئەم ناوچەیە چاپەمەنیی کوردیی تیا نەبێ .

هەر وەك لە ڕۆژانی باباندا ئەم تەوژمی زمان و ئەدەبیاتە ناوچەکانیتری کرمانجیی خوارووی گرتەوە ، هەروەها لەم دەورانەشدا ئەو دیمەنە هەر بینراوە . زۆر بەسەرتێکچوونی دەسەڵاتی شێخ مەحموودا ڕانەبوردبوو کە حوزنیی موکریانی چاپخانەی (زاری کرمانجی) ی هێنایە ڕەواندز و کردی بە دەستگایەکی ئەوتۆی ڕۆشن بیریی کوردی کە تا ئێستا هەر لەکاردا بێت .

لە ناوچەی کەرکووك و هەولێر دا بە گشتی یا لەهەندێ شوێندا ، هەمیشە یا ناو بەناو بە کوردی خوێندن هەر هەبووە . هەموو ئەم نووسین و ئەدەبیاتە و خوێندنەش هەر بەو زمانە ئەدەبییە بووە کە لە سلێمانی بەکارهێنراوە . بۆ ناوچەی هەورامانیش ، هەر وەك تەوژمی ئەدەبیاتی بابان وایکرد کە زۆر لەوانەی هەورامی نەبوون و بە هەورامی یا بڵێین بە شێوەی گۆران دەیاننووسی وازیلێبێنن و بەو شێوە تازەیە بنووسن. لەم دەورەدا خوێندنی کوردی هەرلە زووەوە چووە ناوچەی هەورامانی خوارووەوە و هەر لەو کتێبانەشدا کە لە سلێمانی دەخوێنران ، بەم جۆرە لە هەوراماندا کۆمەڵێ خوێندەوار پەیدابوون کە بە تەواوی بەو شێوە ئەدەبییە بخوێنن و بنووسن . باری بەرەوپێشچوونی

ژیانی ئابووریش وایکرد کە ناوچەی هەورامان نەتوانێ لەو قاوغە ئابووریە کۆنەی خۆیدا بژی کە جاران تیایدا بوو ، واتە بێ پەنا بردنە بەر بەرهەمی کشتوکاڵ و پیشەسازیی هیچ جێگەیەکی تر بتوانێ بژی وێیە لە ئەنجامی تێکەڵیی تازەی ئابووری و بازرگانییەوە وای لێهاتووە کە زۆربەی خەڵکی هەورامان هەردوو شێوە باش بزانن . هەر وەك سروشتەکەی هەورامان خۆی کەوا هەڵکەوتووە کە بۆ کشت و کاڵ دەست نەداو دەستی پیشەسازی و هاوینەهەوار ئاوەدان کردنەوە هێشتا نەك هەورامان بەڵکو هەموو کوردستانی نەگرتۆتەوە، ئەمە وایکردووە کە خەڵکی هەورامان لە پاڵ توجارەت دا (لەدەرەوەی هەورامان) ڕووبکەنە خویندەواری و فەرمانبەر پێگەیاندن . لە ئەنجامی ئەمەدا وای لێهاتووە گەر جاران لە سلێمانی یەوە فێرکەر دەرچوو بۆ هەورامان و بەشێوەی سلێمانی خەڵکی ئەو ناوچەیەی فێردەکرد . ئێستا زۆر لە فێرکەرانی ناوچەی هەڵەبجە و تەنانەت سلێمانی هەمووی و تا ناوچەی سۆرانیش خەڵکی هەورامان بن و هەر بەو شێوە یەکگرتووەی خوێندن دەرس بڵێنەوە ، گەر کەسی ئەوتۆشیان تیاهەڵبکەوێ کە خەریکی نووسین و ئەدەبیات بێ ئەوە ئەویش هەر بەو شێوە یەکگرتووە دەنووسێ بە شێوەکەی خۆی نا [٥] .

بۆناوچەی سنە و موکریانیش – هەر وەك لەوێش هەر لە سەردەمی بابانەوە و پاش کزبوونی شیعری دیالێکتی گۆران هەر لەسەر پێڕەوەکەی (نالی و سالم و کوردی) شیعر دەستی پێکرد ، هەر لەو کاتەوە و تا ئێستاش ئەم پێڕەوە هەر بەردەوام بووە . ئەو شتانەی لە ناوچەی سنە دەنووسرێن و دەگەنە ئێمە ، یا ئەو نووسەرانەی خەڵکی ئەو ناوچەیە کە لەو گۆڤار یان ڕۆژنامانەدا دەنووسن کە جاروبار لە ئێرانا ڕێگەی پێدەدرێ یا جاروبار کوردی ئێران لە دەرەوەی وڵات دەری دەکەن هەر بەو شێوە یەکگرتووە دەنووسن . ئەم بڕیارە زۆر قوڵتر و فراوانتر بەسەر خەڵکی موکریاندا

---

[٥] لە گۆڤاری گەلاوێژدا ناوی گەلێ نووسەر دەبینین کە خۆیان کەلهوڕن یا کرماشانین و (لە جیاتی شێوەی خۆیان) هەروەك نووسەرانی تری گەلاوێژ نووسیویانە . هەروەك یەکێ لە نووسەرە گەورەکانمان کە مەلا جەمیل بەندیی ڕۆژبەیانی‌یە ، شێوەی قسەکردنی خۆی (ڕۆژبەیانی) یە کە بەشێکە لە دیالێکتی گۆران . بەڵام نووسینەکە کە هەر بەم زمانە ئەدەبی‌یە یەکگرتووەی ئێستای ئێمەوە دەیخاتە ریزی نووسەرانی گەورە و ئەو نووسەرانەشەوە کە کوردی باش دەنووسن . هەروەك لە ناو خەڵکی هەوراماندا ئێستا نووسەر و شاعیر هەر بەم زمانە ئەدەبی‌یە دەنووسن و دەتوانین لەوانە ناوی ئەم خاوەن بەرهەمانە ببەین :
شێخ محەمەدی ئەمین کاردۆخی ، حەمە کەریم رەمەزان ، دانای هەورامی ، ڕەشید هەورامی ، عوسمانی هەورامی .. هتد .

دێتەدی . چونکە ناوچەی موکریان لەپاڵ ئەوەدا کە مێژووی ئەدەبیاتەکەی ئەم دوو سەدەیەی لەگەڵ ناوچەی سۆران و سلێمانی و سنەدا جیاناکرێتەوە. ئەوێش وەك سلێمانی ساڵێکی گەشەدار و زێڕین لە مێژووی نیشتمانپەروەری و سیاسییدا هەیە کە کارێکی تەواوی کردە سەر بزوتنەوەی ڕۆشن بیری و سەر ئەدەبیات کە تا ئێستا تەئسیری هەر مابێ .

## کۆماری کوردستان :

ئەو ساڵەش ساڵی دامەزراندن و دەسەڵاتی کۆماری کوردستانە کە مەهاباد و پایتەختی بوو و زۆری دەسەڵاتی لە ناوچەی موکریان دابوو .

مێژوو نووسان دەتوانن زۆر شتی ڕەنگین دەربارەی ئەو ساڵە بنووسن و نیشتمانپەروەران و شاعیران و شۆڕشگێڕانیش لە تۆماری یادگارا زۆر وێنە و تابلۆی ئازایەتی و فیداکاری بۆ بەجێبهێڵن . . بەڵام بۆ ئەم باسەی ئێمە ، ساڵی ١٩٤٦ ئەو ساڵەیە کە زمانی کوردی بە زمانی ڕەسمی ئەو ناوچەیە ناسرا کە دەسەڵاتی کۆماری کوردستانی تیابوو . فەرمانی سەر کۆمار بەو زەمانە دەردەچوو کاروباری دەستگای دەوڵەت بە کوردی بوو ، قوتابیی کورد بە زمانی زگماکی خۆی کەوتە خوێندن . تاقە چاپخانەکەی (کوردستان)لە مەهەبادا کەوتە گەڕ و هەموو شتی بۆ کاروباری کۆمار و قوتابخانە چاپ دەکرد و کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردی کەوتنە دەرچوون .

ئەو زمانە ئەدەبی‌یەش کە بۆ ئەم مەبەسانە بەکاردەهێنرا هەر ئەو زمانە بوو کە لە دەوری بابانەوە گەشەی سەندبوو . تەنانەت لە ڕووی خوێندنەوە هەر بەرهەمی تەجروبەی بیست و چوار ساڵەی ناوچەی سلێمانی براو بەپوختەی لەوێ سوودی لێبینرا . هەر وەك لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی کۆمارەکەشدا کاری ئەم تەجروبەیە زۆر دیار بوو[٦] .

[٦] هەروەك رابەری ئێستای بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد مستەفا بارزانی لەگەڵ جەنگاوەرە بەرزانی‌یەکاندا چووە مەهاباد و بوونە یەکەم شورەی پتەوکردنی ئەو کۆمارە ، هەروەها لە کوردستانی عێراقەوە گەلێك خوێندەوار و نووسەر و مامۆستا چوونە مەهاباد و لە دەسگای فێرکردن و ڕۆژنامە و نووسینی کۆمارەکەدا جێگەی دیاریان هەبوو .

لەم ساڵەی ڕێڕەوی دوایی بە یەك شێوە نووسینی موکریان لەگەڵ سێبەشە دیالێکتەکەتیری کرمانجی خواروودا جێگیربوو وای لێهات کە هەر وەکو تا ئێستا دەنگی سروودی ئەو سەردەمە لە گوێی ئەو لاو و کاڵانەدا دەزرنگێتەوە کە ئەو سەردەمەیان بە قوتابێتی یا گەورەیی دیوە . هەروەها تەئسیری جێگیربوونی ئەو شێوە نووسینەش لە بەرهەمی ئەو نووسەر و شاعیرانەدا دیاربێ کە لەو ناوچەیەدا پێدەگەن یا لە بنەچەدا لەوێوە هاتوون [٧] .

## زمانی ئێستای ئەدەبیات :

کەواتە ئەم شێوە نووسینەی ئێستا لە بەشی زۆری کوردستانی عێراق و ئێراندا پێی دەخوێنرێ و دەنووسرێ و زمانی ئەدەبیاتە ، شێوە نووسینێکی یەکگرتووی کوردییە کە هەموو خاوەنانی کرمانجیی خواروو (سنە – سلێمانی ، سۆران – موکریان) و نووسەرانی کوردی (گۆران) و هەندێ نووسەری کوردی لوڕ [٨] بەکاری دەهێنن . ئێمە ناتوانین بە هیچ جۆرێك بەم شێوە ئەدەبییە بڵێین : شێوەی سلێمانی ، چونکە هەر وەك نووسینەکە خۆی ، تەنانەت نووسینی شاعیران و نووسەرانی شاری سلێمانیش لەگەڵ قسەکردنی ناو ماڵیاندا جیاوازییەکی بچوکی هەر هەیە . هەروەها وورده وورده گەلێك ووشەی ئەم بەشە دیالێکت و دیالێکتانەی تری تێکەڵ بوو هەر وەك هەندێ بنەڕەتی گرامتیکیی ئەوانیش جێی خۆی تێدا دۆزیوەتەوە و هەندێ لە جیاوازییەکانی فۆنەتیکی خەڵکی سلێمانیش لێرەدا جێگەی نەبوەتەوە .

زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو لێرەدا لەسەرچاوەیەك دەچێ : کە لە سەرەتاکەیدا ، واتە لە ژێر زەمیندا ، چ لە دیمەن و تام و پێکهاتنیدا هەر ئاوی ڕوونە و بریتییە لە دوو بەش هایدرۆژین و بەشێك ئۆکسجین ( $H_2O$ ) بەڵام کە ماوەیەك بە ژێر زەویدا دەڕوات زۆر ڕەگەزی تری تێکەڵ دەبێ و تا لووتکەی تێربوون لە ئاوەکەدا دەتوێتەوە و

---

[٧] لە کوردستانی عێراقدا چەند نووسەرمان هەیە کەلە بنەچەدا موکریانین و نووسینەکانیان شەقڵی ئەو لە موکریانەوە هاتنەی تیادا دیارە . هەروەك لە کوردستانی عێراقدا ژیان لە شەقڵی موکرێتیی نوسینی گیوی موکریانی و هەژار و حەسەنی قزڵجی و ڕەحمانی زەبیحیی نەگۆڕیوە .
[٨] دیارترین نووسەر لەناو کوردی لوڕی عێراقدا نووسەر کامیل حەسەن بەسیرە کە نووسینە کوردییەکانی هەر بەم زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەیە .

کە بە ڕەگەزیتر گەیشت هەندێ لە تواوەکەی پێشوو دادەنێ و هەندێك شتیتر دەتوێنێتەوە . تا لە ئەنجامدا و لەو کاتەدا کە هەڵدەقوڵێ لە ئەنجامی ئەنالیزدا هەر ($H_2O$) دەرناچێ ، بەڵکو شتێکیتر دەردەچێ کە ڕەگەزی یەکەمی ئاوە ، هەرچەندە دیمەنی دەرەوە و ڕواڵەتی هەر لە ئاوی سادە یا لە ئاوێکی پەتی ڕوون دەچێ .

بەم چەشنە ئەو زمانە ئەدەبیەی ئێستا بووە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ناوچەیەکی فراوانی کوردستان و ئەو کوردانەی بە سێ دیالێکتی کوردی دەدوێن بەو زمانە دەخوێنن و دەنووسن و زمانی نووسینی ئەدەبیاتیانە . هەر زمانە لە سەرەتاوە لە شاری سلێمانیدا بوو بە زمانی ئەدەبیات و بڵاوبۆوە و هەموو ئەو تێکەڵ بوون و تواندنەوە و ڕۆچوونەی بەسەرداهاتووە کە بەسەر زمانی ئەدەبیی هەموو نەتەوەکە . ئەم زمانە لەگەڵ شێوەی قسەکردنی شاری سلێمانیدا جیایی هەیە ، هەرچەندە ڕەواڵەتەکەی هەر شێوەی ئەو شارەی پێوە دیارە .

بەڵام ئایا ئەو زمانە ئەدەبیە یەکگرتووە بووە بە زمانی یەکگرتووی هەموو نەتەوەی کورد ؟ گەر نەبووە دەبێ بپرسین — ئایا نەتەوەی کورد ئەمڕۆ دوو زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەیە یا یەك ؟ ئایا زمانی ئەدەبیی کوردی کردن بۆ دوو لەگەڵ ڕێڕەوی مێژووی نەتەوەی کورد و قانزاجی زەحمەتکێشانی ئەو نەتەوەیەدا دەگونجێ یا نا ؟ ئایا پەیداکردنی دوو زمانی ئەدەبیی لەگەڵ پێداویستەکانی بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلی کورد (کوردایەتی) دا یەکە ؟ گەر یەك نەبێت ئەو چەشنە هەوڵە لە مێژووی نەتەوەی کورد و کوردایەتیدا بە چی دەژمێردرێن ؟ پاش وەڵامی ئەمانە ئایا ئەم زمانە ئەدەبیە یەکگرتووەی ئێستا لە قاڵبی ئێستایدا لێی‌دێ و دەتوانێ ببێ بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو نەتەوە ؟ چۆن دەتوانین ئەو ڕێبازە بدۆزینەوە کە مێژوو بۆ دروست بوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو هەموو نەتەوەی داناوە و چۆن ئەمەی ئێستا وا لێ‌دەکرێ کە ببێ بە بنکەی پەیدابوونی ئەو زمانە ؟

لەم لاپەڕانەی دوواییدا هەوڵ دەدەین بە پێی ڕای خۆمان و بە پێی ئەو باوەڕەی لە ئەنجامی خوێندنەوە و تەجروبەوە پەیدابووە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە .

ئایا زمانێکی ئەدەبی یەکگرتوومان هەیە ؟

یەکەم : وەك ووتمان ئەم زمانە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئەوانەن کە بە هەموو بەشەکانی کرمانجیی خواروو دەدوێن و ئەوانەی بە دیالێکتی گۆران دەدوێن و تا ڕادەیەکیش ئەوانەش کە بە لوڕی دەدوێن . بەڵام ئەم شێوە نووسینە ئەدەبی‌یە هێشتا نەبووە بە شێوەی نووسینی ئەوانەی کە بە کرمانجیی ژووروو دەدوێن ، کە ئەمانە لە ڕووی ژمارەوە بەشی زۆرتری کوردن . هەرچەندە هەندێ شاعیر و نووسەری ناوداری ئەوتۆشمان هەیە کە شێوەی ئاخافتنی ماڵەوەیان یەکێکە لە بەشەکانی کرمانجیی ژووروو بەڵام نووسینیان هەر بەم زمانەیە کە لای ئێمە بووە بە زمانی نووسین و خوێندن و ئەدەبیات [9] .

کەواتە ئەم زمانە نەبووە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو نەتەوەی کورد . بەڵام هەر وەك نەبووە بەو زمانە یەکگرتووە ، هەروەها ناتوانین بڵێین ئێستا کورد دوو زمانی ئەدەبیی یەکگرتوویان هەیە . چونکە هەر لەو کاتەدا کە ئەم زمانە لە دەوری بابانەوە تا ئێستا زمانی ئەدەبی ناوچەیەکی گەورەی کوردستانەو لە ساڵی (۱۹۲۲) ەوە تا ئێستا زمانی خوێندن و نووسینی بەشی زۆری ئەو ناوچەیەبە . هەر لەو کاتەدا شێوە زمانێکیتر نابینین کە لە دەوری بابانەوە تا ئێستا بەو شێوە فراوانە و بەو بەردەوامی‌یە زمانی ئەدەبیات بێت و لە هیچ شوێنێکیتری کوردستان دا بە کوردی خوێندن نی‌یە و زمانی کوردی بەڕەسمی نەناسراوە تا شێوەیەکیتری لەمە بەدەر ببێتە زمانی یەکگرتوو با لە ناوچەیەکی تەسکیشدا بێت .

---

[9] جگەرخوێنی شاعیری ناودار لە دیوانەکانی‌یا چەند پارچەی هەیە کە بەم زمانە ئەدەبی‌یە نووسیویەتی (بەشێوەکەی خۆی نا) ، هەروەك لە ناو زانا و نووسەرانی بە دیمەنمان دا دکتۆر رەحمانی قاسملو قسەی ماڵەوەی کرمانجیی ژوورووە ، بەڵام نوسینەکانی هەر لەوکاتەوە کە لە ڕۆژنامەی کوردستان دا دەینووسی (۱۹٥٤) تا ئێستا لە نوسینی شاعیر و نووسەرانی موکریان جیاناکرێتەوە .
(قەدری جان) ی شاعیریش بە تەئسیری گۆڤاری گەلاوێژ هەمیشە هەر ووشەی هاوبەش بەکاردێنێ .

بەڵێ – بەشی بۆتانی [10] کرمانجی ژووروو لە دەورێکدا و تا کۆتایی سەدەی حەڤدەهەم لە ناوچەی خۆیدا زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو بووە و ئەدەبیاتی لە کاتێکدا پێ نووسراوە کە ناتوانین بڵێین خوێندن و نووسین بە کوردی هەبووە ، چونکە زمانی ڕەسمیی خوێندنی مزگەوت (کە تاقە شوێنی خوێندن بووە) ، عەرەبی و تا ڕادەیەکیش فارسی بووە . بەڵام ئەو زمانە ئەدەبیی‌یە پاش لەناوچوونی میرنشینی بۆتان و بادینان کشایەوە و پەرەی نەسەند . هەر چەندە تاکو تەراو تا ئێستاش شاعیر هەبووە کە شیعریان پێ نووسیوە ، بەڵام هیچ یەکێ لەو شاعیرانە توانای ئەوەی نەبووە کە ئەدەبیاتەکەی لە سنووری ناوچەکەی خۆی بباتەدەرەوە. ئەو هەوڵە مەردانەیەش کە لە ساڵی ١٨٩٨ [11] بەدواوە بۆ ئەوە درا کە دەوری زێڕینی ئەو شێوەیە بهێنێتەوە کایەوە و بەرەوپێشی بەرێ . بە هۆی سەرنەکەوتنی شۆڕشەکانی کوردستانی تورکیاوە سەرینەگرت و کپ بوو.

---

[10] بەشی گەورە و ڕەنگینی ئەدەبیاتی کرمانجیی ژووروو بە بەشی بۆتانی ئەو دیالێکتەیە ، هەرچەندە شاعیرەکان خۆیان خەڵکی بۆتان نەبوون . واتە لەو دەورەدا بەشی (هەکاری و بایەزیدی و ئاشتایی و بادینانی) لە ئاخافتندا بەکارهێنراوە و بەشی (بۆتانی) لە نووسیندا بۆ نموونە : مەلای جزیری – لە بۆتان – ژیاوە فەقێی تەیران (هەکاری)یە ، عەلیی حەریری گەر خەڵکی حەریری (سۆران)یش نەبێ ، ئەوا خەڵکی شەمدینانە و (هەکاری)یە . خانی (بایەزید)ی‌یە . شێخ محەمەدی مەغریبی و بەکر بەگی ئەرزی (بادینان)ین ، هەرچەندە بناغەی ئەدەبیاتی هەموویان هەر بەشە شێوەی (بۆتان)ە . هەرچەندە (خانی) ش شیعری خۆی بە تێکەڵ یا وەك لە بۆتان دەبێژن بە (تەڤ لو هەڤ) دەزانێ و دەربارەی مەم و زین و ئەو دیالێکتانەی تێیدا بەکارهاتوون دەڵێ :

بۆهتی و مەهمەدی و سلیڤی

هەن لەعل و هەنەك ژ زێڕ و زیڤی

[11] لە ٢٢ی نیسانی ١٨٩٨ دا یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی کوردستان بە بەشە دیالێکتی بۆتان دەرچوو پاش ئەوە میرجەلادەت بەدرخان و دکتۆر کامەران بەدرخان چەند گۆڤار و ڕۆژنامەی وەك (ڕۆژانوێ) و (هاوار) و (ستێر) و (روناهی) یان دەرکرد و بەهاندانی کۆمەڵەی (خۆیبوون) گەلێك نووسین هاتە بەرهەم . بەڵام زۆرتر هەر لە سنووری سوریە و لوبنان دا مایەوە و توانای ئەوەی بۆ دروست نەبوو کە بە فراوانی بگاتە ناوچەکانیتری کوردستان و کارێکی باش بکات . گەر ئەمەش بە بزوتنەوەیەکی ئەدەبی و چاپەمەنی دابنێین ئەوا ئەویش پاش جەنگی دووەمی جیهان کپ بوو .

گەر ئێستا لە شوێنێکیتر زمانی کوردی لەسەر بناغەی کرمانجیی ژووروو زمانی خوێندن و نووسین و ئەدەبیات بێت . ئەوا ئەو تەجروبەیە لەبەر گەلێك هۆی جوغرافی و مێژووییە ناتوانی بە چەشنی ئێستای پەل بۆ کوردستان بکێشێ . مەبەس تەجروبەی کوردی سۆڤێتی بوو . لەبەر ئەوەی زروفی مێژوویی خۆیان لە کوردستانی دابڕیون ڕێگەیەکی تایبەتیی خۆیان لە پەرەپێدانی خوێندن و نوسین و ئەدەبیاتدا گرتووە . بەڵام کوردی سۆڤیەتی لەبەر ئەوەی کە ژمارەیان کەمە و هەر لە ١٪ ی ژمارەی هەموو کورد دەبن و لە سنوری کوردستاندا نین و لە شوێنی خۆشیان لە چوار کۆماری سۆڤیەتیی لە یەك جیادا دەژین و ڕژێمی سیاسیش وای کردووە کە بەم زوانە نەتوانن کارێکی کاریگەر بکەنە سەر ئەدەبیات و ژیانی کەلچەری کورد . لەبەر ئەوە ئەو زمانە ئەدەبیەی ئەوان نابێ بە زمانی ئەدەبیی هەموو کورد بەڵکو ئەم زمانە ئەدەبیەی ئێستای ئێمە وورده وورده کار دەکاتە سەر زمانەکەی ئەوان [١٢] .

---

[١٢] تا شۆڕشی (١٤)ەی تەمووزی ١٩٥٨ی عێراق زانا و نووسەرانی کوردی سۆڤیەتی زۆر کەم ئاگاداری ئەدەبیاتی ئەم دوو سەدەیەی کوردستانی عێراق بوون. بەڵکو لەبەر ئەوەی شێوەکەیان نەدەزانی و کەم بەرهەمیشیان دیبوو . وێنەیەکی شێواو دەربارەی ئەم ئەدەبیاتە لە مێشکیاندا بوو . ئەو کوردانەی موکریانیش کە لەوێ مابوونەوە و بوو بوون بە زانا ، هەرچەندە شێوەکەیان دەزانی ، بەڵام دابڕان لە وولات و رووداوەکانی لە لایەك و تەمەنی ئەو کاتەشیان کە وولاتیان تیا بەجێ هێشتبوو ( لە ڕۆژانی کۆماری کوردستاندا) وای کردبوو کە شارەزا نەبن و ئاگاداری کوردستانی عێراق نەبن بەڵام ڕووداوەکانی پاش (١٤)ی تەمووز و پێوەندی پەیداکردن دەرگای بۆئەوان و ئێمەش کردەوە .

گەر ڕۆژێك بێت زمانی ئەدەبیی ئەوانیش لەگەڵ ئێمە دا یەك بگرێ ، ئەوا شانازییەکی گەورە بۆ ئەو نووسەر و خوێندەوارە کوردانەی عێراق دەنووسرێ کە لەوێ لە ئەدەب و زمان و مێژووی کورددا دوکتۆرایان وەرگرت . کە بێجگە لەوەی زۆر لە زانا و نووسەر و شاعیری ئەوانیان فێری ئەم زمانە ئەدەبیە کرد . هەروەها ڕێگەی ناسینی ئەدەبیاتی ئەم دوو سەدەیەی لای ئێمە یان پیشان دان کە ئەمە هەر کاری نەکردە سەر زانین و ئەدەبیاتیان تەنانەت کاری کردە سەر ڕۆژنامە و ئێستگەی کوردیشیان . هەروەك بەمە کۆمەڵێك ڕۆشنبیری کوردی عێراقیش شارەزای بەرهەم و پێش کەوتنی ئەدەبیی زمان زانیی ئەوان بوون .

کەواتە — بەم حاڵەشەوە هەر یەك زمانی ئەدەبیی کوردیمان هەیە . هەرچەندە هەندێ شاعیر و نووسەری ناوچەی (بادینان) یش ئێستا هەوڵی ئەوە دەدەن کە بە بەشی بادینانی کرمانجیی ژووروو (بۆتان نا) بنووسن . بەڵام ئەو چەند نووسینە ئەو بەشە شێوەیەی نەکردووە بە زمانی ئەدەبی نەك لە کوردستانی عێراقدا تەنانەت لە بادینانیشدا . چونکە ئەو شێوەیە تا ئێستا نەبووە بە زمانی ڕەسمیی دەوڵەت و زمانی خوێندن و نووسین . بەشە شێوەی بادینان — تا ئێستا هەر شێوەی ئاخافتنی خەڵکی بادینانە و دیارە هەر لە شێوەی ئاخافتنیشدا هەر دەمێنێتەوە ، هەر وەکو شێوەی فۆلکلۆریکی دەوڵەمەنیشە . گەر هەوڵی ئەوە بدرێ بە بەشە شێوەی بادینان نووسین پەرەی پێبدرێ و بڵاوبکرێتەوە ، چەند کۆسپ و ئەنجامێکی سەیر لەبەردەمی ئەو هەوڵەدا دەبینرێ .

یەکەم : زۆر زەحمەت و ئەرك و هەوڵی دەوێ کە ئەو بەشە دیالێکتە ببێ بە زمانێکی ئەدەبیی فراوان چونکە لەبەر پێنەنووسینی تا ئێستای ، کەم کەسی شارەزای ئەو تۆ هەن کە بتوانن بە چەشنێکی ئەدەبیی ساکار و جوان بە بادینانی بنووسن و نووسینەکەیان بچێتە ناو خەڵکەوە ، تەنانەت گەر کتێبی قوتابخانە بە بادینانی بنووسرێ ئەوا ئەوەندە بادینانی نووسی بە توانامان دەست ناکەوێ کە ژمارەی لیژنەی کتێب نووسینیان لێپەیدابێ و ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی بە کوردی خوێندن لەو ناوچەیەدا دوا بکەوێ [١٣]

---

[١٣] لەسەرەتای شۆڕشی (١٤)ەی تەمووزی ١٩٥٨دا توانای ئەوە هەبوو خوێندن لە بادینان بکرێ بە کوردی بەڵام ئێمە لەجیاتی دا چەسپاندنی ئەو دەستکەوتە خەریکی موناقەشەی چەشنی کتێب و کام دیالێکت بووین کە ئەو توانایە لەدەست چوو و ئەو لە دەست چوونە ١٢ ساڵی خایاند و خوێندن لە بادینان بە عەرەبی مایەوە . گەر مەسەلەی نەتەوەیش ڕەچاونەکرێت . دیارە کە قوتابیی بادینان نەك بەم کوردیەی ئێستا بەڵکو بە شێوەی پەتیی شاری سلێمانیش بخوێنێ سوود زیاتر وەردەگرێ وەك لەوەی بە عەرەبی بخوێنن . گەر بەراوردێکی ڕاستەقینەش بکەین . ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە منداڵێکی بادینان باشتر لە شێوەی سلێمانی دەگات . وەك لەوەی منداڵێکی عەرەبی بیابانی نەژاد یا هۆڕی عەمارە و صەعیدی میسر لەو کتێبانەی قوتابخانە دەگات کە بە عەرەبیی فەسیح نووسراون . گەر وا لەمەسەلە بگەیشتینایە ئەرکی ئەم دوانزە ساڵ دواکەوتنە نە دەکەوتە ئەستۆی خۆمان .

دووەم : گەر ئەوەش بسەلمێنین کە بادینانی نووسین سەردەگرێ ، ئەوە لە پاڵ هەموو ئەنجامی دووری دا ئەو ڕاستییەش هەیە کە ئەو نووسینە هەر بۆ بادینان دەست دەدات و نابێ بە زمانی ئەدەبیی بۆ هەموو ئەو ناوچانەی بە کرمانجیی ژووروو دەدوێن . چونکە ئەدەبیاتی کرمانجی ژووروو تا ئێستا هەر بە بۆتانی بووەو لە کێشەی سروشتیی بەشە شێوەو شێوەکان دا دیارە کە بۆتانی بە ئاسانی جێگەی خۆی بۆ بادینانی چۆڵ ناکات و شێوەی بۆتان لەبەر ئەوەش کە زیاتر پێی نووسراوە ، لە بادینانی زیاتر بەرەوپێشەوە چووە و نەرم تر بووە و زیاتر لە تێگەیشتنی خەڵکی کوردستانی خوارووەوە نزیکە . ئەمە بێجگە لەوەی کە بادینانی بەشێکە لە پێنج بەشی کرمانجیی ژووروو (بۆتانی – هەکاری – بایەزیدی – ئاشتایی – بادینانی) ، و زوربەی خوێندەوارانی ئێستای بادینان تا ئێستا توانای ئەوەیان نییە کە نەك چەشنی نووسینیان لەگەڵ بۆتانی دا یەك بخەن ، بەڵکو باش لە بۆتانیش ناگەن [١٤] .

دەبێ چۆن بنووسین ؟ بەیەك جۆر یا دوو ؟

دووەم : پرسیار کەوەڵام دانەوەی ئەوێ ئەوەیە . کە ئایا دەبێ کورد بە جۆرێك بخوێنێ و بنووسێ و یەك جۆر زمان لە کاروباری ڕەسمی و ئەدەبیاتدا بەکاربێنێ کە لە هەندێ وڵات زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو و لە هەندێ لا زمانی (ستەندارد) ی پێدەڵێن . یا دەبێ دوو جۆر بەکاربهێنێ . تا ئێستا کەس بە نووسین یا ڕاستەوڕاست ئەوەی دەرنەبڕیوە کە دەبێ کورد بە دوو جۆر بنووسن . بەڵام زۆر کەس و زۆر جێگا بە کردار ئەمەیان دەرخستووە .

ڕادیوی بەغدا لە بەیانیی چواردەی تەمووزی ١٩٥٨ەوە کرا بە دوو شێوە . لە ساڵی ١٩٥٦دا ڕۆژنامەیەکی نیشتمانیی نهێنی بە هۆی ئەوەوە کە دەرکەران و نووسەرانی

---

[١٤] بەداخەوە تا ئێستا لەبەر نەزانین تەنانەت لە کتێبی قوتابخانەشدا زۆر لە شیعری مەلای جزیری و خانی و جگەرخوێن و قەدری جان بە هەڵە نووسراونەتەوە بە تایبەتی لە نووسینەوەی تیپی دەنگداردا چونکە کەم لە خوێندەوارانی بادینان ئاگاداری فۆنەتیکی (بۆتان) ن و کەمیش بەرهەمی کۆن و دەوری دووەمی بۆتانیان خوێندۆتەوە .

له ڕاستیی مەسەلە نەگەیشتبوون ووتاری بە دوو شێوە بڵاوکردەوە [١٥]. دوا بە دوای ئەو پاش چواردەی تەمووز زۆر ڕۆژنامە و گۆڤار ئەم ڕێبازەیان گرت و ئێستاش زۆر لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانمان وا دەردەچن ، تەنانەت گۆڤاری (برایەتی) ماوەیەکی زۆر کرابوو بە دوو بەشەوە ، بەشێك بەو زمانە ئەدەبیی‌یەی ئێستا دەنووسرا و بەشێك بەناوی بەشی کرمانجی‌یەوە هەندێ ووتاری بە بۆتانی و هەندێکی بە بادینانی تیا بڵاودەکردەوە . وەك گۆڤارەکە بە دوو زمان دەربچێ .

دەستگاکانی هۆشیاریی ئێران ، بە تایبەتی ئێستگەکانیان زۆر هۆشیارانە سوودیان لەم دوو بەشی‌یە دیو ئەوان لە باتی دووبەش چەند بەشیان دروست کردووە . گەر ئەم ڕێبازە هەر وا تەخت بێت ئەوا هەر لە کوردستانی عێراقدا تابلۆی چەندساڵێکی ترمان بەم جۆرە دەبێ :

دوو ئێستگە دوو تەلەفزیۆن ، دوو چەشنە گۆڤار و ڕۆژنامە ، دوو چوشنە قوتابخانە ، لە هەموو پۆلێکی دانشگای کوردستان یا کۆلێجی ئەدەبیاتی کوردیدا دوو لق ، هەر لقە بە شێوەیەك . لە هەموو دەسگا پێویستی دارەکانی کوردستان دا تەرجومانێك – بۆ کوردی کردن بە کوردی . گەر سەربەستیی کوردی بەکارهێنان بەشیتری کوردستانیشی گرتەوە ، ئەوا ئەم تابلۆیە فراوانتر دەبێ و وورده وورده لە زمانی یەکگرتووی کوردی، کە زۆر دەمێکە هەیە و یەکی گرتووە . لە جیاتی ئەوەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دروست ببێ . دوو زمانی ئەدەبی یا زیاتر دروست دەبێ و لە ئەنجامدا زمانە یەگرتووەکەش دەبێ بە دوو زمان و نەتەوەی کورد کۆڵەکەیەکی پەیدابوون و بوونە نەتەوەی خۆی لە دەست دەدا و دەبێ بە دوو نەتەوە ، یا زیاتر . جا ئەو نووسەرانەی ڕێبازی جیاکردنەوەی نووسینی کوردیان گرتووە و ئەو دەسەڵاتدارانەش کە پشتی ئەمانیان گرتووە ، هەستی‌یان پێکردبێ یا نەکردبێ ڕێبازی

---

[١٥] مەبەس ڕۆژنامەی (ئازادی کوردستان)ە کە دەبێ دان بەوەدا بنێم کەلێپرسراو بەرامبەر بەم هەڵەیە تا ڕادەیەك نووسەری ئەم باسە و زۆرتر (دیلان)ی شاعیرمانە . هەروەك دەبێ دان بەوەدا بنێم کە ڕابەرانی ئەوسای پارتی دیموکراتی کوردستان چ ئەوسا و چ پاش تەمووزی ١٩٥٨ هەڵوێستێکی عیلمی‌یان بەرامبەر بەم چەشنە نووسینە هەبوو ، کەهەر لەو ڕێبازە دەچێ کە ئێستا لەم باسەدا نەخشەی بۆدەکێشین .

ئەوەیان گرتووە کە زمانی کوردی بکەن بە دوو زمان و نەتەوەکەش بکەن بە دوو نەتەوە . دیارە کە لە باسێکی عیلمیی وەك ئەم باسەدا دەبێ لەوەش بدوێین ، کە ئایا ئەم بە دوو بوونە ڕێبازی مێژووی نەتەوەی کورد خۆیەتی یا نا ؟ ئایا ئەمە یەکێکە لە مەبەسەکانی بزوتنەوەی کوردایەتی یا پێچەوانەی ئەوە ؟ ئایا ئەمە قانزاجی کۆمەڵانی فراوانی خەڵکی کوردستانی تیایە یا زیان بە دواڕۆژی ئەوان دەگەیێنێت ؟

بێگومان : هەستی یەکیەتی لە زۆر کۆنەوە لەناو کورددا بە قووڵی تەشەنەی سەندووە کە نەتوانین سەرەتای بۆ دابنێین گەر ئەحمەدی خانی (سەدەی حەڤدەهەم) بە ڕابەرێکی نەتەوەیی ئەوتۆ دابنێین کە بەرنامەیەکی ئاشکرای کوردایەتیی خستبێتە بەرچاو ئەوا پێش ئەو مەلای جزیری خۆی لە سنووری بۆتان هانیوەتە دەرەوە بۆ سنووری فراوانی کوردستان و ووتویەتی :

**گوڵی باخی ئیرەمی بۆتانم شەب چراغی شەبی کوردستانم**

بەڵگەی مێژوویی کۆن و تازە و ئێستا زۆر بە دەستەوەن کە ئەوەمان پێبسەلێنن کە هەموو کورد لە کوردستانی گەورەدا خۆیان بە کوڕی یەك نەتەوە دەزانن و سەرکەوتن و سەرگرتنی ئامانجیان لە یەکێتیی نەتەوەکەدا دەبینن .

لەبەرئەمە زمانی کوردی کردن بە دوو کە سەرەتای کورد کردن بەدوو نەتەوەیە ، هەر وەك پێچەوانەی بەرنامە و مەبەسی بزوتنەوەی کوردایەتی و چاکەو ئاوات و ئارەزووی نەتەوەی کورد و کۆمەڵانی فراوانی خەڵکی زەحمەتکێشی کوردستانە هەروەها تەوژمێکی کزی بە پێچەوانە هاتووی ڕێڕەوی مێژووشە . کە هەمیشە بەو لایەدا بەرەوپێش کەوتن و سەرکەوتن دەڕوات کە خواست و چاکەی گەلان و ڕەنج کێشانی تیایە .

گەر ئەم چەشنە هەوڵە ماوەیەك لە ناوچەیەکدا سەریش بگرێت ئەوا ئەنجامی دوایی هەر سەرنەگرتن و نەمانە و دەچێتە ریزی ئەو تەوژمە پێچەوانانەی لە مێژووی سیاسیی گەلان دا جاروبار هاتوون کە پێش کەوتن بوەستێنن ، بەڵام دوایی هەر تەوژمی بەرەوپێشەوەی گەلان و مێژوو ئەوانی ڕامالیوە .

ئـەم چەشـنە تەوژمـە گزانـەی بـە پێچـەوانەوە دێـن ، چ لـە کـۆڕی مێـژوودا و چ لـەم مەیدانانەدا دەتوانن بەو تۆزە سەرکەوتنەی کە تەمـەنی نـیـە رۆیشتنی مێـژوو خـاو بکەنـەوە یا تەنانەت هێندەی ئەو تەمەنە کورتەی خۆیان ڕایبگرن بەڵام نـاتوانن بـەرەودوای بـەرن و لـە پێش کەوتنی دوایی و کۆتایی بخەن .

کەواتە : پاش ئەوەی گەیشتینە ئەو دەرنجامەی کە دەبێ زمانی ئەدەبیی کوردی هەر یەك بێت . دەبێ بپرسین ئـەو زمانـە ئەدەبیـیە یـەکگرتووە کامەیـەو دەبـێ چـۆن بێت ؟

هەندێ لەوانە هەوڵی ئەویانە کوردی بکەن بـە دوو زمـان و خۆیـان بـە کـردەوە ئەو ڕێگەیان گرتووە ، بە نـاوی ئـەوەوە کـە کرمـانجیی ژووروو زمـانی ئاخـافتنی بەشـی زۆری کوردە [١٦] لایان وایە کـە دەبـێ هـەموو کورد کرمـانجیی ژووروو بکـەن بـە زمـانی ئەدەبیی یەکگرتووی خۆیان .

ئەم ڕایە – بەلای ئێمەوە – نەڕاستە و نەدێتە دی . چونکە : گەر ئەو بنەڕەتـە دیموکراتیـیـەی بـاس لـە سەرشـۆڕکردنی بەشـی کـەم بـۆ بەشـی زۆر دەکـا لـە مەیـدانی زماندا ڕاستیش بێت ، ئەوا لێرەدا پێچەوانە دەبێتەوەو ئەو ئەنجامە ناگەیێنێ کە ئـەوان دەیانــەوێ . هەرچــەندە مەســەلەی زمــان و بڵاوبوونــەوەی و داچەســپاندنی زمــانی ئـەدەبیی یـەکگرتوو کـاری مێـژووە و ئـەو شـتی ڕاسـت دەچەسـپێنێ و هـەوڵی ناڕاسـت ناهێڵێ ، بەڵام بڕیاردان بۆ ئێرەڕاستیش بـێ و هـەر لەسـەر ئـەو پێـڕەوە دیموکراتیـیـە بڕیاریشمان دا کە کرمانجی ببێ بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو ئەوا مەیدانی هێنانـەدیی

[١٦] زۆرتـری ئـەم موناقەشـەیە هـەر بـە ووتنـەو کـەمی نووسـراوە ، گـەر لـە هـەموو بەڵگـەکانی خاوەنانی ئەو ڕایەدا بەڵگەیـەك هـەبێ ، کە لامـان وابێ بۆ ئەوە دەشێ موناقەشە بکرێ ، ئـەوە تـەنیا ئـەم باسـی کـەمی و زۆرییەیـە . بـەڵام بەڵگـەی تـر و باسـی نزیکـی کرمـانجیی ژووروو لـە فەرەنسییەوە نزیکـی کرمـانجیی خـواروو لـە فارسـیەوە ، ئەمـە لـە لێکۆڵینـەوەی عیلمـیدا جـێی نابێتەوە . چونکە کەسێك کە شارەزاییەکی کـەمی لـە مێژووی زمـان دا هـەبێ دەزانـێ فارسـی و کوردی هەردوو لە گرووپی ئێرانیی زمانە هیندۆ ئەوروپاییەکانن بۆیە دەبێ کوردی لـە فارسـی زیاتر بچێ ، وەك لە فەرەنسی و ئینگلیزی و رووسی .

بڕیارەکەمان بۆ ئێستا و وا دیارە تا ماوەیەکیش ( کە ماوەی ئەوەی نییە دەستەوسان چاوەڕێی تیا بکەین) هەر کوردستانی عێراق دەبێ. چونکە توانایەکی وامان نییە کە لە شوێنی تردا بڕیارەکەمان بەجێبهێنین.

کەواتە مەسەلەی زۆر و کەمەکە بۆ کوردستانی عێراق پێچەوانە دەبێتەوە و لێرە کە ئەمڕۆ مەسەلەی خوێندن و نووسین کاری ئەمڕۆیە و بڕیار و بە گورجی هێنانەدیی دەوێ . ئەوەی بە کرمانجیی ژووروو دەدوێن بەشی کەمن و ئەوەی بە دیالێکتی تر دەدوێن و زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوویان هەیە بەشی زۆرن .

پاشان وەك ووتمان : گەر ئەم چەشنە بڕیارە ڕاستیش بێ و هەوڵی هێنانەدیی بدرێ ، ئەوا بۆ کرمانجیی ژووروو کردن بە زمانی ڕەسمی کادرو خاوەن توانامان نەك بۆهەموو کوردستانی عێراق بەڵکو بۆ ناوچەی بادینانیش نییە . گەر ئێستا بتوانین لە چەند ساڵێکدا زمانی کوردی بکەین بە زمانی خوێندن و نووسین و کاری ڕەسمی ناوچەی بادینان ، ئەوا بەکارهێنان و ئامادەکردنی شێوەکەی خۆیان بۆ ئەم مەبەسە چەند ئەوەندەیتر ساڵی دەوێ . خۆ گەر ئەمە بۆ هەموو کوردستانی عێراق بێت ، ئەوا بێزیاد پێوەنان ، دەبێ لە دەوری بابانەوە دەست پێبکەین .

گەر سەرگرتنی ئەم ڕایە بە شێوەیەکی ساکار تر بخەینە بەرچاو ئەوە لە ڕاستییا ئەوە دەگەیەنێ کەلە ڕۆژانی بابانەوە تا ئێستا چی کراوە و نووسراوە لابرێ ، یا وەك دەڵێن فڕێ بدرێتە ڕووبارەوە . ئەمەش لە مەیدانیتری ئیشی ووڵاتدا هەر لەوە دەچێ کە بڵێین : بۆ ئەوەی کارگەی میوەی قوتوو لە دهۆك بکەینەوە ، دەبێ کارگەری چیمەنتۆو جگەرەی سلێمانی نەمێنێ . یا بۆ ئەوەی هاوینە هەواری هەورامان پێش بکەوێ ، دەبێ شەقڵاوە و حاجی ئۆمەران و پیرمام و سۆلاڤ هەر لە بنەڕەتدا نەهێڵین . کە ئەم چەشنە بیرکردنەوەیە بنەڕەتی عیلمیی نییە و لەگەڵ پێش کەوتنی نەتەوەی کوردیشدا ناگونجێ .

کەواتە : دەبێ چۆن بنووسین و زمانی ئەدەبیی یەکگرتوومان کامەیە .

وەك ووتمان : زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی نەتەوە مێژوو دروستی دەکا و ئارەزووی تاقەکەس و دەستەیەك ڕۆڵی کاریگەریان لە بەرەوپێش چوونی مێژوودا

نی‌یه ، بەلام تاقەکەس دەتوانێ ڕێڕەوی ڕاستەقینەی مێژوو بەدیبکا و لە گەڵیدا بڕوات و پاڵ بە خێرا ڕۆیشتنیەوە بنێت و نەبێتە کۆسپ لە ڕێگایدا و نەبێتە هۆی دواخستنی ئەو پێشەوەچوونەی .

لەم جۆرە هەڵوێست و تێگەیشتن و تەجروبەیەوە لامان وایە کە نەتەوەی کورد زوو یا درەنگ زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی خۆی دروست دەکا ، کە دەبێ بە زمانی ڕەسمیی خوێندن و نووسین و ئەدەبیاتی هەموو کورد کە ئەم زمانە هیچ یەکێ لەم شێوانەی ئێستا نی‌یە ، هەرچەند دیمەن و تەئسیری شێوەیەکیان لەو زمانەدا زیاتر دیار دەبێ .

کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووش پێکهات مانای وانی‌یە کە شێوەی ئاخافتنیش دەبێتە یەك . بەڵکو کوردی هەر لایە وەك خۆی دەدوێ ، بەلام هەموو کورد وەك یەك دەنووسن .

هەرچەندە شێوەیەك دیمەنی لەوانیتر زیاتر بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووەوە دیار دەبێ ، بەلام ئەو زمانە زۆر ڕەگەزی تێکەڵی شێوەکانی ئێستای تیا دەبێ . واتە لە هەر شێوەیە شتێك خۆی لەو زمانەدا دادەچەسپێنێ . لەبەر ئەوەش کە زمانەکانی جیهان بەرەو ئەوە دەڕۆن کە خۆیان لە ئالۆزی و سەختی ڕزگاربکەن ، لەبەر ئەوە دەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین کە پێڕەوە ئاسانەکەی گراماتیك ، ئیتر گەر گشتی بن یا لە یەك دیالێکت دا بن خۆیان لە زمانی ئەدەبی دا جێگیر دەبن کە لە هەموو دیالێکتەکان دا یەکن ، یا لە زوربەیاندا لەیەك دەچن .

بۆ ووشە و فەرهەنگ (مفردات) یش ئەوا ئەو زمانە ئەدەبی‌یە تا دێت فراوانتر و دەوڵەمەندتر دەبێ و ووشەی هاوتای تیا زیاتر دەبێ و سەرچاوەی ئەمەش دیالێکتە جیاکانی زمانی کوردی و فێربوونی ئەو دیالێکتانەیە لەلایەن خوێندەواران و نووسەرانەوە .

کەوات : پاش ئەوەی داسەپاندنی کرمانجیی ژووروومان بە ڕاست نەزانی ، پرسیارێکی ئاشکرا و ڕەوا دێتە پێشەوە کە ژیان خۆی و پێداویستیی ئەمڕۆش وەڵامی ئەو پرسیارەی دەوێ . ئەویش ئەوەیە:

ئایا چۆن بنوسین و کام شێوە ببێتە شێوەی نووسین و خوێندن و کاروباری ڕەسمی ، کەلەوە بووینەوە کە ئەم نووسینە دەبێ بۆ هەموو کورد یەك چەشن بێت . ئایا ئەم زمانە ئەدەبی‌یە یەکگرتووەی ئێستا ئێمە لە بەشی زۆری کوردستانی عێراق و ئێران دا [١٧] بەکاری دەهێنین لە باری ئێستایدا بە کەڵکی ئەوە دێت کە ببێتە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو کورد ؟. یا ووردتر بڵێین ئەم زمانە کە واقیعی ژیانی ئەمڕۆمان وای‌لێکردووە کە لە دەرگای ناوچەی (بادینان) دا بوەستێ و ببێ بە زمانی کاروباری ڕەسمی و خوێندن و نووسین لەو ناوچەیەدا و لە ماوەیەکی دووردا ببێتە زمانی ئەدەبیاتیش ، ئایا ئەم زمانە لەم بارەی ئێستای دا دەتوانێ ئەو جێگەیە بگرێ و دەرگای بادینانی لێ‌بگرێتەوە ؟

## بادینان – مێژووی و ئێستای :

بۆ وەلام دانەوەی ئەم پرسیارە دەبێ تاوێك لای مێژووی بادینان و لای بەشە دیالێکتی بادینان بوەستین . بە داخەوە تا ئێستا لە ناوچەی ئێمەدا زۆر لە خوێندەواران هەوڵی ئەوەیان نەداوە کەلە مێژووی ڕاستەقینەی ناوچەی بادینان بگەن و گەر لە مەیدانی رۆشنبیری دا دواکەوتنێك لەو ناوچەیەدا ببینین ، ئەوا هەوڵی ئەوە نەدراوە کە لە هۆی ڕاستەقینەی ئەو دواکەوتنە بگەین بۆ ئەوەی بە تەواوی بە ڕێبازێکی راستدا چارەسەری بکەین . هەروەك هەندێ لە خوێندەوارانی بادینانیش چەشنە هەستێك وایان لێ‌دەکا دان بەو دواکەوتنەدا نەنێن و لە ئەنجامیشدا هەر بەلای چارەسەرکردنی ڕاستەقینەدا نەچن .

---

[١٧] هەندێ لە نووسەرانی موکریان ڕووی ڕەخنە دەکەنە شاعیر و نووسەرە لاوەکانی ناوچەی سلێمانی کەوا شەقڵی ئاخافتنی شاری سلێمانی زۆر بە نووسینیانەوە دیارە . بێگومان ئەمە ڕاستە و وا دەزانم ئەرکی نەتەوەیی بەرامبەر بە یەکگرتنی زمانی ئەدەبی‌مان پاڵمان پێوەدەنێ کەلە نووسین دا چ هەندێ پێڕەوی بچووکی گراماتیك و چ دەربڕینی هەندێ تیپ و دەنگ و چ هەندێ ووشە وازلێ‌بێنین کە تایبەتی بە شاری سلێمانی‌یە . بۆ نموونە : وا بزانم ڕاستتر ئەوەیە کە بنووسین : دەنووسم – دەڕۆم ، بەلام ئەنووسم و ئەڕۆم بخوێنینەوە زیانی نی‌یە . هەروەکو دەبێ تیپی (د) و (نگ) وەك هەموو کورد بنوسین بەلام با لە خوێندنەوەدا بە پێی فۆنەتیکی سلێمانی بخوێندرێنەوە .

بادینـان – کـه زۆرتـر ، بـه تایبـەتی لـه سـەرەتای پێکهـاتنی میرنشـینی بادینـان دا بریتـی بـوو لـه ئامێـدی و دەوروپشـتی بـەڵام لـه هەنـدێ کـات دا پـەرەی سـەندووە تـا گەیشـتۆتە میرنشـینی داسـنی و شووشـی و سـلیڤانی و تـا زاخـۆ و سـندی و شیروانیشـی گرتۆتەوە [18].

ئەم ناوچەیە لە کۆندا خاوەنی مێژوویەکی کۆنـه و لـه پـێش ئیسلامیشدا شوێن شارسـتانی بـووە و لـه سـەدەکانی دوایـیدا میرنشـینی خـۆی هـەبووە و لـەم دوو سـەدەیەی دواییدا مەڵبەندی خـەباتێکی نەسرەوتی بێپشوی خـوێنین و قارەمانانـه بـووە . پێوەنـدیی بادینـان لـه ڕووی شـێوەی زمـان و نزیکیـی سـنووری لـه وولاتـی بۆتانـەوە وایکـردووە لـه شێوەیەکی خەباتکاریدا پێوەندیی لەگەڵ ڕاپەڕینـەکانی کوردی بۆتـان و هـەکاریدا هـەبێ و له سەرەتای ئەم سەدەیەشدا بێپشوو خۆی جێگەی خەباتی چەکدارو خوێناوی بێـت و هـەر لـه پـاش جـەنگی یەکـەمی جیهانـەوە ئازایانـه بەرامبـەر بـه ئیمپریـالیزمی ئینگلیـز و نیراوەکانی ئیمپریالیزمی ئەمەریکاش بوەستێ و له زۆر جاردا کوردستان بکات بـه چاڵی گیان کێشانی نوێنەرانیان .

له ڕووی هەستی نەتەوەیی وبەشداری خەباتی نەتـەوەی کوردەوە ناوچـەی بادینـان به هوشیاری و له پێشـەوەیی ناسـراوە و تۆمـارێکی ڕەنگینـی قارەمـان و شـەهیدی زۆری خـۆی هەیـه . بـەڵام وەك لـه دەوری داگیرکـەری عوسمانیـدا نزیکیـی بادینـان لـه خـاکی تورکـەوە وای کـرد دەسـەڵاتی یەکسـەری تـورك نـەختێ لـه ناوچـەی سۆران و سلێمانی بـەهێز بـێ . هـەروەها لـه پـاش دروست بـوونی دەوڵـەتی ئێسـتای عێـراقیش بەسـتنی بادینان بە لیوای مووسڵەوە وایکرد که لـه ڕووی ژیـانی ئابووریـەوە وەك دێهـاتی ئامـادە بۆ بازاڕی مووسڵ و بۆرژوازیی گەشەسەندووی مووسـڵ تەماشـای بادینـان بکـرێ و ئـەم تەماشاکردنە لە ژیانی ئابووری و ڕوشنبیری ئەم ناوچەیەدا دیاربێت.

لـه ڕووی ئابووریـیـەوە بـه هـەموو چەشـنێك مانـا عیلمیـیەکـەی (لادێ) ی شارستانی مووسڵ لێرەدا بێتە دی و هەوڵی ئەوە نەدرێ کە پیشەسازیی تیـا پـەیدا ببـێ و تەنیا بەرهەمی کشت وکاڵ و میوە بـۆ مووسـڵ بەرهـەم بهێنـێ و کرێکاری لـه دەست

---

[18] بۆ ئەم مەبەسە تەماشای کتێبی } انور المائي . الاكراد في بهدينان . الموصل ، ١٩٦٠{بکە .

دەرەبەگ ڕاکردووی بە هەرزان ببەخشێ بە پیشەسازیی شار و بازاڕێکیش بێت بۆ ئەو شتانەی لە کارگەی شاردا دروست دەکرێن .

جا هەر وەك بە مەبەسی بەردەوام بوونی ئەم دەسەڵاتە هەمیشە هەڵی بەهێز کردنی دەرەبەگێتیی خۆماڵیی بادینان دراوە هەروەها هەوڵی ئەوەش دراوە کە گیانی کوردایەتی لەم ناوچەیەدا بمرێنرێ و ڕێگەی ئەوە نەدرێ کە هیچ چەشنە دەسگایەکیڕۆشنبیری کەلە ناوچەی سلێمانی و سۆران دا د [illegible] ـرەدا[٦٢] دروست ببن . لەبەر ئەمە هەر لەو کاتەدا کە خوێندنی کوردی لە سلێمانی و کەرکووك و هەولێردا خۆی دەپاراست یا پێش دەکەوت، لێرەدا بە کوردی ئاخافتن لە زۆر قوتابخانەدا لە ڕۆژانی (هێمنی)شدا قەدەغە دەکرا . ئەم بارە کە پەنجا ساڵێکی خایاند چووە سەر ئەو دواکەوتنە گردەوەبووەی دەوری عوسمانی و کارێکی تەواوی کردەسەر ئەوەی کە نەك خوێندنی کوردی و بە کوردی خوێندنەوە لە بادینان دا نەبێ ، بەڵکو ڕادەی خوێندەواری و ژمارەی ڕۆشنبیرو خوێندەوار لێرە لە شوێنەکانیتری کوردستانی عێراق کەمتر بێت . بادینان لە کۆندا هەر وەك میرنشینی خۆی هەبووە ، هەروەها مەڵبەندی خوێنددەواریش بووە و لە مزگەوتە گەورەکانی بادینان دا قوتابخانەی قوباد هەبووە . زانای گەورە و شاعیری تیا پێگەیشتووە . بەڵام باری ئەم دوو سەدەیەی دوایی تەواو کاری کردۆتە سەر ژیانی ڕۆشنبیری و خوێندەواریی کوردی و گەر کاری ئەو گزنگەی بۆتان نەبوایە لەوانە بوو بارێکی خراپترمان بدیبایە .

کەواتە : دەبێ بە باشی لەم بارە بگەین لەوەش بگەین کە ئەم ساڵانی کارەساتە هۆشیاری و هەستی نەتەوەیی خەڵکی بادینانی بەرزکردۆتەوە و خەباتی خوێناویی ڕەنگینی دوو سەدە ، سامانێکی گەورەی فۆلکلور ، بە تایبەتی (لاوك) ی دروست کردووە کە هێشتا دەستی کۆکردنەوەو نووسینەوەی نەگەیشتۆتێ و لە خۆیدا سامانێکی گەورەی فراوان کردنی زمانی ئەدەبیمانە . دەبێ دروست بوونی موحافەزەی دهۆك بکەین بە هەنگاوێك و بە دەرگای خوێندەواریی کوردی لە بادینان دا . بەڵام دیسانەوە دەپرسینەوە کە چۆن بنووسین و چۆن وا بکەین کە زمانە ئەدەبیەکەی ئەمڕۆمان بچێتە بادینانەوە .

سەرەتا دەبێ لەو کتێبانەوە دەست پێبکەین کە بۆ قوتابخانە دەنووسرێن . پاش ئەوەی بریارمان دا کە دەبێ لە هەموو کوردستانی عێراقدا یەك چەشنە کتێب هەبێ نەك دوو ، دەبێ دانەر و وەرگێری کتێب کە جاران تەنیا بە دەربەست تێگەیشتنی قوتابیی سلێمانی و هەولێر و کەرکووکەوە بووە ، ئەمڕۆ بە دەربەست تێگەیشتنی قوتابیی بادینانیشەوە بێت [19] . بۆ ئەمە دەبێ لە نووسین و داڕشتنی کتێب دا لە ڕووی گراماتیك و فۆنەتیك و فەرهەنگەوە ئەو پێڕەو و ووشانە بەکار بهێنرێن ، کە لە هەموو دیالێکتەکاندا یەکن . ئەوەش کە جیایە ئاسانترینیان بەکاربهێنرێ و وورده وورده قوتابی فێری پەیڕەوەکەی بەرامبەری بکرێ بۆ ئەوەی لە ئەنجام دا و پاش چەند ساڵێتر کە هەر خوێندەوارە چەند پێڕەوی جیاوازی زانی ، زەوقی گشتی ئەوە دەدۆزێتەوە کە ئاسانتر و ڕەوانترە . ئەمە بۆ فەرهەنگ و ووشەش تەواو ڕاستە . کە قوتابی بەرامبەر بە زۆر ووشە چەند هاوتای زانی وورده وورده یا یەکێك بەم هاوتایانە لە زمانی ئەدەبیدا جێگیر دەبێ ، یا هەندێ ووشەی ئێستا لە زمانی ئەدەبیدا یەکە ، ئەوسا هەر لەو زمانەدا چەند ووشەیان بەرامبەر دەبێ کە دەچنە فەرهەنگی زمانی ئەدەبیی هەموو نەتەوەوە و لە سنووری ناوچەی خۆیان دەچنە دەرەوە .

هەر بە مەبەسی تێگەیشتنی قوتابیی بادینان لە کۆتایی هەموو دەرسێکی قوتابخانەدا فەرهەنگێك بۆ ووشەکان بکرێت کارێکی سوود دارە .

بێگومان ئەم سەرەتایە کە لە قوتابخانەوە دەست پێدەکات دەبێ لە قوتابخانەوە بەرەو هەموو گۆڤار و ڕۆژنامەکان بڕوات بە جۆرێکی خەملیو بەرهەمی نووسەرانیش بگرێتەوە .

---

[19] بێگومان لەم مەسەلەیەدا و لە مەسەلەی زمانی ئەدەبیی یەککرتووشدا نابێ ناوچەی خانەقین لەبیربکرێت ، هەرچەندە گەلێك هۆی مێژوویی وایکردووە کە خوێندەوارانی خانەقین بە ئارەزوو و هەستێکی بەرز و تێگەیشتنی مەسەلەوە ڕووبکەنە فێربوونی ئەو زمانە ئەدەبییەی ئێستای ئێمە .

ئەم کارەی باسیدەکەین شتێکی زۆر ئاسان نییە و بە شێوەیەکی میکانیکی پێك نایەت [٢٠] بەڵکو دەبێ کارێکی زیندوو و پڕ لە ئیبداع و ساکار بێت و زۆر لەخۆکردنی تیا نەبێت . بۆ ئەم مەبەسەش ئەرکێکی گەورە دەکەوێتە سەرشانی نووسەر و شاعیرانی خوارووی کوردستان . ئەویش بە باشی ڕووکردنە سامانی کرمانجیی ژووروو . گەر نووسەر و شاعیرمان بە باشی لەو سامانە بگەن . ئەوسا زۆر لەسەرخۆو بە بێ داتاشین و زۆر لەخۆکردن ، هەر لە خۆیانەوە هەنگاو بەرەوزمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو دەنێن کە باشتر لە ناوچەی بادینان جێیبیێتەوە ، هەروەك خۆشیان لە ووشك بوونی کەرەسە و سامانی زمان ڕزگار دەکەن کە زۆریان ئێستا تێیکەوتوون ووشە و کەرەسەی نووسینیان هەر ئەوەیە کە لە هۆنراوە و نووسینی لەمەوبەریان دا نووسراوە . لەم بارەیەوە دەبێ ئەو بەڵگە زیندووەمان لە بیرنەچێت کە ئەدەبیاتی ئەم سەردەمەی ئێمە تۆماری کردووە ، ئەویش ئەوەیە کە چ پیرەمێرد و چ گۆران لەو زمانە کوردیيە پەتی و پوخت و پاراو و دەوڵەمەندەدا کە بەکاریان هێناوە ، قەرزاری ڕووکردنە دیالێکتی هەورامی و ئەدەبی فۆلکلۆرن . لەم بارەیەوە دەبێ زۆربەی نووسەر و شاعیری خوارووی کوردستان دان بە کەم و کووڕییەکی مەزنی خۆیاندا بنێن . کە ئەویش دووریی ئەوانە لە سامانی ئەدەبیاتی کرمانجیی ژووروو . بێوەستاندن دەتوانین بپرسین : چەند لە شاعیرانی خوارووی کوردستان شارەزای شیعری مەلای جزیرین ؟ . چەندیان بە ووردی (مەم و زین)ی خانییان خوێندۆتەوە و سوودیان

---

[٢٠] لە هەندێ نووسیندا کە لەم پاشاگەردانیی ڕادەربڕینەی لای ئێمەدا دەبینرێ ، باسی (موتوربە) کردنی زمان کراوە . ئەم چەشنە ڕایە لە بۆچوونی عیلمییەوە دوورە و دیارە خاوەنانی ئەو چەشنە ڕایە تەواو لەوە نەگەیشتوون کە زمان وەك درەخت یا وەك کەرەسەی لیبراتۆری (مختبر) ی لەگەڵ ناکرێت ، بەڵکو زمان وەك گیان لەبەرێکی کۆمەڵ وایە کە لە کۆمەڵدا پەیدادەبێ و دەگۆڕێ هەموو ڕووداوێکی کۆمەڵ و مێژوو کاری تێدەکا و بەرەو پێشەوە یا بەرەو نەمان و تێکەڵ بوونی دەبا.

بەداخەوە یەکێ لەو ووتار نووسانەی لە (موتوربە) کردنی زمانی کوردی دوابوو ، تەنانەت ئەرکی ئەوەی نەدابووە بەرخۆی کە هیچ نەبێ گەر بە زمانی تریش نەبێ بە کوردی چەند ووتار یا کتێب دەربارەی زمان بخوێنێتەوە ، هەروەك بەشکردنی کوردی بە هەڵە بە دوو شێوە واتە (سۆرانی و بادینانی) ئەوە دەردەخا کە خاوەن ووتار تەنانەت نووسینەکانی (تۆفیق وەهبی) یشی نەدیوە ، تا لەوەبگات کە سۆرانی و بادینانی بەشە دیالێکتن و دیالێکتی سەربەخۆ نین .

لێوەرگرتووە ؟ خۆ لە فەقێی تەیران و حەریری و گرگاشی و ئەرزی و پرتەو بەگی هەکاری نابێ لای ئەوان بپرسین و تەنانەت کەم کەسیش دەبینین کە دوو دێڕ لە جیاوازیی هۆنراوەی جگەرخوێن و قەدری جان بزانێ . یا بەدڵ شوێن ئەدەبیاتی کوردی سۆڤێتی کەوتبێ و شتێکی لە بەرهەمی دامەزرێنەری ڕۆمانی کوردی عەرەب شەمۆ خوێندبێتەوە .

لە هەموو ئەمانەش گرنگتر – بۆ ئەمڕۆ ئەو لاوك و فۆلكلۆرە دەوڵەمەندەی ناوچەی (بادینان) ە کە بە پیت ترین زەوی روونترین سەرچاوەن بۆ دامەزراندنەوەی داستانی هۆنراوەی کوردی و بۆ نووسینی رۆمان و دەوڵەمەندکردنی زمان و وێنە و تابلۆی شیعر .

کەواتە : ئەرکێکی نەتەوەیی و ئەدەبی پاڵ بە نووسەر و شاعیری کوردستانی خوارووەوە دەنێ کە بەڕاستی ڕووبکەنە ئەو سامانە . بێگومان لە تەمەنی نەوەیەکدا بەری ئەم هەوڵ و تەقەلایە دەبینین و ئەو کاتەی لە بادینان نووسەر و شاعیری وا پێدەگا کە باش شارەزای سامانەکەی ژووروووەو لەو کتێبانەوە دەرگای فێربوون و تێگەیشتنی سامانی ئەدەبیاتی خوارووی بۆ کراوەتەوە کە بەم چەشنە نووسراون کە باسمان کرد . هەر وەك نووسەری ئێستا لاوی خواروو تێگەیشتنی سامانی ژووروو توانا و بەهرە و زمانی ئەدەبیاتی نووسینی ئەوی قاڵ کردووە .ئەو کاتەی ئەم دوو نووسەرە هەردووکیان شتێکی لەیەکەوە نزیك دەنووسن و ڕەنگە نەوەی دوای ئەوان هەر تەواو وەك یەك بنووسن .

ئەو زمانی خوێندن و نووسین و ئەدەبیاتەی بەم چەشنە دروست دەبێ گەر ئێستا دیمەنی دەرەوەی بەشە شێوەی سلێمانی بێت و جەوهەرەکەی تێکەڵیی بەشەکانی کرمانجیی خواروو و هەندێ لە دیالێکتی گۆران و لوڕی تیابێ . ئەوا لە هەنگاوی یەکەمدا نیسبەتێکی لە پێیرەو و ووشەی بادینان تێکەڵ دەبێ و تا دێت ئەم نیسبەتە پتر دەبێ و ئەمە لە تێکەڵاوی (تفاعل)ێکی ڕاستەقینەی زیندوودا لە بۆتەی ژیان دا قاڵ دەبێ و شتێك لە دیمەن و ناوەڕۆکی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئەمڕۆی خوارووی کوردستان دەگۆڕێ و وا لەو زمانە دەکا کە بە تەواوی ببێ بە زمانی یەکگرتووی هەموو کوردستانی عێراق و ئێران و لە ئێستا زیاتر بۆ ئەوە بشێ کە ببێ بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو نەتەوەی کورد . هەروەك دروست بوونی ئەم زمانە یەکگرتووەی ئەدەبیات نووسین خۆی شتێکی میکانیکی نییە ، هەروەها ناتوانین لە ئێستاوە وەك دەرمانێکی گیراوە نیسبەتی هەر ڕەگەزە یا هەر دیالێکتەی تیا دەست

نیشان بکەین یا بریاربدەین کە بە چەند ساڵ ئەم زمانە ئەدەبییە یەکگرتووە پێك دێ .
چونکە هەر وەك زمان بەشێکە لە کۆمەڵدا پێك دێ و هۆی بەستنی ئادەمیزادە بە کۆمەڵەوە، هەروەها ئەم تێکەڵ بوون دروست بوونەش ، تەنیا ڕووداوێکی زمانەوانی نییە کە کۆمەڵ و پێوەندی ڕووداوە سیاسی و ئابووری و شۆڕشگێڕییەکانی کاری تێنەکەن. لەبەر ئەمە زۆر دوور نییە کە ژیان خۆی بەو هەموو بەسەرهاتانەوە کە دەیهێنێ . زۆر لەم تابلۆیە بگۆڕێ کە ئێستا وا لەبەرچاوی ئێمە و نەخشەی بۆ دەکێشین .

یا ڕووداوێکی چاوەڕێ نەکراوی ژیان تەئسیری زیاتری هەبێ لە پەیدابوونیدا ، یا بە زووتر لەوەی ئێمە بیری لێدەکەینەوە دروستی بکات .

بەهەموو جۆرێ ئەو زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەی وا دروست دەبێ کە ئێستا لەبەرچاومانە زۆر لەوەی ئێستا پتر دەتوانێ بچێتە هەموو ناوچەکانی کرمانجیی ژووروە . گەر توانای واش پەیوابوو کە وەك ئەمڕۆ دەتوانین خوێندن لە بادینانیدا بکەین بە کوردی ، لە کوردستانی تورکیاشدا منداڵی کورد بە زمانی خۆی بخوێنێ و لای کوردی ئەو ناوچەیەش ڕێگەی پەرەپێدانی ئەدەبیات هەبێت. ئەوا ئەو کاتەش هەموو پرسیارەکانی ئێستا دووبارە دەبێتەوە و ئەوسا لەسەر بناغەیەکی تازە نەخشە بۆ زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو کورد دادەنێین کە مێژوو خۆی هەر دروستی دەکات . بەڵام ئەم تەجروبەیەی ئەمڕۆی کوردستانی عێراق تەواو ڕێگابۆ ئەو یەکگرتنە خۆش دەکات و ئاسانتری دەکات و ئەوسا نەتەوەی کوردیش با وەك هەموو گەلانی جیهان بە چەند دیالێکت و بەشە دیالێکت بدوێ ، بەڵام هەر بە یەك جۆر دەنووسێ ، بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی .

## فەرهەنگۆکێك

**بـــــــۆ خوێندنەوەی ئەم نامیلکەیە**

( با ) ـــ بادینان . ( بۆ ) ـــ بۆتان . ( س ) ـــ کوردی سۆڤێتی .

( لا ) ـــ لاتینی . ( ع ) ـــ عەرەبی . ( ت ) ـــ تورکی .

ئه - ئا

ئەسپ : هەسپ

ئارەزوو : رغبه (ع)

ئەوەی : ئەڤی

ئاوات : هیوا ، هێڤی

ئێستا : نوکه ، نهۆ ، ڤێگاڤێ

- تائێستا :هەتانوکه ، حەیانهۆ

ئابووری ئیکۆنۆمی (لا) ، اقتصاد (ع)

ئەژمێرریَ : دەژمێرری ، دێته هێژمارتن

ئەدویَ : قسەدەکات ، خەبەر ددات . دەدویَ ، ئاخاڤێت ، دپەیڤێت

ئەووتریَ : دەووتریَ ، دێتەگوتن ، دەبێژریَ

ئەروا : دەچیَ ، دچەت

ئالۆدەیی : سەودایی — تعلق (ع)

ئەگونجیَ : دەشیَ ، دبیت

- گونجان : شیان — بوون

ئەنجام : نتیجه (ع)

ئەرخیتێکچەر : ئەرکیتێکچەر (لا) ، هونەری میعماری

ئیکۆنۆمی : ئابووری

ئاخافتن : قسەکردن ، دواندن ، خەبەردان ، پەیڤین .

ئاگادار : ب ئاگاه ، خەبەردار

بنەچە : ئەسڵ

بەیانی : سبەهی ، سەحەری

ئەك : ئیش مهمه (ع)

ئێره : ڤێریَ

— ب —

بەڵام : لیَ ، بە — لیَ

بناغـه : بنـەڕەت ، هـیم ، بنەسـتر ، بنکـه ، شەنگسته .

بیستوویانه : بهیستنه ، ژنەفتنه

بەرەوپێش چوون : پێشڤەچوون

بتوانیَ : بشێت ، بکارەت

بەرهەم : انتاج (ع)

بڵاوکردنەوە : بلاڤ کردن

بەستراوە : گریَ دایه

بیرکردنەوە : هزر کرن

بزووتنەوە : بزاڤ ، جڤین

بار : حال

بت : هەلامەت (با) ، صنم (ع)

بیر : هزر

بلیمەت : عبقری (ع)

بەداخەوە : مەخابن

بڵیَ : بێژه ، ببیَ

بەرزەخ : سَد (ع)

بەش : پشك ، قسم (ع)

بەکار هێنرا : بکارهات

بەڵگە : دەلیل

بەرامبەر : ژ هەمبەر

بۆتە : بودقە (ع)

— پ —

پتەو : قایم ،مکوم

پەڕاندنەوە : دەربازبوون

پاڵ پێوەنان : پاڵ دان

پێش کەوتن : پێشڤەچوون

پیش کەتوو : پێشڤەچوو

پوختە : پاقژ

پوختە ترینیان : پاقژ ترێ وان

پێش شۆڕش : بەری شۆڕشێ

پەل هاویشتن : تغلغل (ع)

پەرەسەندن : بەلاڤ بوون

پەرەبسێنێ : بەلاڤ بت

پێداویست : پێویست ، لازم

پێدەڵێ : دبێژتەوی

پێوەندی : علاقە (ع)

پێست : پیست ، پۆست ، چەرم

پەتی : سافی

پاشا گەردانی : بێ پاشایی ، تەڤ لەڤی

پەیڤین (بۆ) : ڤسەکردن ، ئاخافتن

— ت —

تێبینی : سەرنج ، ملاحظە (ع)

تاق : تەنیا ، تەنێ

تەمەن : عومر

تەشەنەی سەندووە : بەلاڤ بوویە

— ج —

جیاواز : جودا ، باشقە (ت)

جیاوازی : جودایی

جێگیر : ثابت (ع)

جۆر : توخم ، نوع (ع)

جوڵایی : تەڤن

— چ —

چەشن : تەخم ، جۆر

چوارچێوە : ملبەند

چەوت : خوار

چۆڵ : والا ، ڤالا

چارەسەر : حل (ع)

— خ —

خوێندەوار : خوێندا ، خوندەڤا

خۆشەویست : خۆشتەڤی ، دەلال

خۆی : بۆ خوە

خوێندنەوە : ڤەخواندن

خێرا : بلەز ، زوو

خەو : خەون

تۆزێك : پێچەك ، هەندەك ، كەمەك

تۆزێكیش : پیچەكژی ، .. هتد

تایبەتی : بە تایبەتی ، خاسما ، نەخاسم

تێگەیشتن : تێ گەهشتن ، فام كردن ، سەروەخت بوون (س)

تێكەڵ : تەڤ ل هەڤ (بۆ)

تر : دی

تریش : دیژی

تیرە : تیر ، ئیجاغ ، فخز عشیرە (ع)

تەوژم : تیار (ع)

تاژیك : تاجیك ، فارس(لێرەدا)

دامەزراندن : تأسیس (ع)

دەستە : دەستەك

دەرچوون : دەركەتن ، دەركەفتن

دیار بوو : ئاشكرا بو ، خویا بو

دۆزیوەتەوە : ڤەدیتییە

دەتوێتەوە : دەتاڤێت

دابران : ژێ بوون

دەرگا : دەری ، قاپی

دەسەلات : زۆر ، توانا

دەستەوسان : بێ دەسەلات

داسەپاندن :فەرزكردن بە زۆر

دێهات : گوندان

خاپاندن (بۆ) : هەڵخەڵەتاندن

— د —

دیالێكت (لا) : شێوە ، زاراڤە ، لهجە (ع)

داچەسپاندن : تپبیت (ع)

دروست بوون : چێ بوون

- دروستی كرد : چێكر

دەوڵەمەند بوون : زەنگین بوون

دەمێكە : ژمێژە

دراوسێ : هاوسێ ، جیران (ع)

دەنووسرێ : دێتە نڤیسین

دەیانەوێ : دڤێن ، دخوازن

دواخستن : پاشڤە برن

دواكەوتن : پاشڤەچون

سەلماندن : اپبات (ع)

سەربەخۆیی : خۆیبوون ، خوسەری

- سەربەخۆ : خوسەر ، خوێبوو

سامان : پروە (ع) ، تراپ (ع)

— ش —

شوێن : جێگە ، جەه ، جیدەرە

شێوە : زاراڤە ، جۆر ، چەشن

شتێك : تشتەك

داتاشین : چیکردن ، دروست کردن

— ر —

ڕێگه : ڕێك ، ڕێ

ڕاستەقینە : ڕاست

ڕاگرتن : سەکاندن ، ڕاوەستاندن ، فەچغاندن .

ڕێباز : ڕێگه

ڕەگەز : عنصر (ع)

ڕووداو : سەرهاتی ، بەسەرهات

ڕەچاو : بەرچاوگرتن

ڕۆژهەلات : ڕۆهەلات

ڕەوانەکردن : فڕیکرن ، هەناردن ، شاندن (بۆ)

ڕەوالەت : دیمەن (ع)

ڕادە : حد (ع)

ڕۆڵ (لا) : دور (ع)

ڕاپەڕین : ڕابوون ، انتفاچە (ع)

— ز —

زگ ماگ : بۆ زمان (زمانی دایك و باوك )

— ژ —

ژیکفە : لەیەك

— س —

سەرەتا : پێش خەبەر ، بەر — نامە ، مقدمە (ع)

سەرچاوە : سەرەکانی

سنوور : تەخویب

شار : باژێر

شیو : شیڤاك ، شیڤ

شەقڵ : شەقلە

شێواو : تێکچوو

— ف —

فۆرم (لا) : شکل (ع) ، روخسار

فراوان : فرەه

فەوتان : تێ چوون

فڕێ دان : ئاڤیتن

فڕێ بدە : با ڤێژە

فێربوون : هین بوون ، عەلمین

— ق —

قسە : گوتن ، پەیڤ

قەڵزەم : دەریا

قوتابی : شاگرد

قاڵ : مصقل (ع)

— ك —

کۆسپ : عائق (ع)

کۆشش : هەوڵ

کەلچەر : کلتوور (لا) ، پقافە (ع)

کات :وەخت ، دەم ، گاڤ

کۆکردنەوە : کۆم کرن ، خڕکرن

کزکردن : کەم کرن

سوود : فێده

سەدە : چەرخ ، بابلیسك (بۆ)

سوتاندن : صوهتن ، شەوتین (بۆ)

سروود : نشید (ع)

کاریگەر : حاسم (ع)

کێشە : صراع ( ع)

کۆڵەکە : ستوون ، عمود (ع)

کشایەوە : ڤەگەریا : تراجع (ع)

— گ —

گەل : میللەت

گشتی : عام (ع)

گەشەسەندن : خەملین ، ازدهار (ع)

گەنج : کەنز ، سامان

گزمان : شك (ع)

گوێ سەبانە : سڤاندە

گروپ (لا) : کۆمەڵە ، مجموعە (ع)

— ل —

لاپەڕە : بەرپەڕ ، ڕووپەل

لێدوان : لێڤەکۆلان

لەبیرچۆوە : ژبیرچوو

کۆڵ نەدەر : خۆگرتی ، صامد (ع)

کۆلکە خوێندەوار : نیڤ خوندەڤا

کەوتە گەڕ : کەتەکار ، کەتەشول کرن

کال : پیر

کپ بوو : مت بوو

کۆمەڵە : جڤات

موتوربە : تگعیم (ع)

— ن —

نووسین : نڤیسین

ناوەڕۆك : محتوی (ع)

نەتەوە : امە (ع)

ناڵێ : نابێژێ

ناقۆڵا : نەڤۆلا

ناوچە : هەرێم ، دەڤەر

نەختێ : پێچەك ، کەمەك

نەخشە کێشان : تخگیگ (ع)

ناتوانین : نەشێین (با) ، نەکارن (بۆ)

— ه —

هاتۆتەناودوە : هاتییە ناڤ

هەڵە :خەلەت ، کەچ

هاوجۆر : یەك سوو ، وەك یەك

هەنگاو : شەڤاو ، پێنگاڤ

هێڵ : خیچ ، خەت

لەناو ئەچێت : تێچوون

لێکۆڵینەوە : لێڤەکۆلان

لق : تا ، چەق

لەیەك ئەچێت : وەك یەك ، بهەڤ دچەت

لێکی بدەنەوە : تەفسیری بکەن

لاو : خورت ، گەنج

لەوێوە : ژوێرا

لەمەبەدمر : ژڤی پێڤە

لابرێ : راکرێ

لادێ : دێهات ، گوندان

لەسەرخۆ : هێدی هێدی ، ب کاوەخۆ

— م —

مێژوو : دیرۆك

مانا : معنی (ع)

مەرج : شەرت

ماوە : دەم ، مدە (ع)

موتابخانە : کارگەی خەرار دروست کردن

مێشك : مژی ، مەغز

میوە : فێقی ، فێکی (بۆ)

مەڵبەند : دیار

هەندێ : هەندەك

هۆ : ئەگەر ، سبب (ع)

هەوڵ : کۆشش ، محاولە — جهد (ع)

هیوا : هێڤی

هەمیشە : هەرگاڤ

هاندان : تشجیع (ع)

هۆشیاری : اعلام (ع) ، وعی (ع)

هەڵوێست : موقف (ع)

هەست : شعور (ع)

هۆنراوە : قصیدە (ع)

— و —

ووتار : گوتار ، مقال (ع)

ووشە : پرس ، پەیڤ ، کلمە (ع)

وەرگرتن : ستاندن

ووشك : حشك ، هشك

وورد : هوور

ووریایی : هۆشیاری

وێنە : دیمەن ، صورە (ع)

— ی —

یەکێکیان : یەك ژوان

# هەندێ سەرچاوە

## به کوردی :


١- عەلا ئەدین سەجادی . مێژووی ئەدەبی کوردی . بەغدا ١٩٥٢

٢- ڕەفیق حیلمی . یادداشت (٦بەرگ) . بەغدا ١٩٥٦-١٩٥٨

٣- تۆفیق وەهبی . کۆمەڵێ ووتار لە گۆڤاری گەلاوێژدا . ساڵی ١ ، ١٩٣٩ ، ١٩٤٠

٤- تۆفیق وەهبی : فەرهەنگی کوردی – ئینگلیزی (بەهاوکاری ئەدمۆنس) ئۆکسفۆرد ١٩٦٦

٥- مەلای جزیری . العقد الجواهری فی شرح دیوان الشیخ الجزری . (شرحه بالعربیه للمفتی أحمد بن الملا محمد البهتی الزفگی) .القامشلی ١٩٥٨

٦- أحمد خانی . مەم و زین . مۆسکۆ ١٩٦٢

٧- دیوانی مەولەوی . کۆکردنەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس .بەغدا ١٩٦١

٨- پیرشالیاری زەردەشتی . دانا محمد بهاوالدین صاحب . بەغدا١٩٦٨

٩- دیوانی (صەیدی)ی هەورامی . کۆکردنەوەو گۆڕینی عیمان هەورامی . سلێمانی ١٩٧٠

١٠- گەنجینە – چوارینەکانی باباتاهیری هەمەدانی . دلزار کردوویە بە سۆرانی . بەغدا ١٩٦٠ . لەگەڵ پێشەکیی کامل حسین بصیر دا .

١١- دوکتۆر رەحیمی قازی . پێش مەرگە . بەغدا ١٩٦٠

١٢- دیوانی سۆران . تبریز ، ١٣٢٤ هەتاوی

١٣- هەژار . بۆ کوردستان . بیروت ١٩٦٦

١٤- دیوان ملا پریشان کرد . کرمانشاه

١٥- دیوانی نالی . بەغدا ١٩٣١

١٦- دیوانی حاجی قادری کۆیی . هەولێر ١٩٦٩

١٧- صالح هەژار . کرمانجی یا سۆرانی . بەغدا ١٩٦١

١٨- معروف خزنەدار . کێش و قافیە لە شیعری کوردیدا . بەغدا ١٩٦٢

١٩- حەمە کەریم رەمەزان هەورامی . سایکۆلۆجییەتی خوێندنەوە . سلێمانی ١٩٦٨

٢٠- سید عبدالصمد تووداری . چەمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان . وەرگێرانی محمدی مەلا کەیم . بەغدا ١٩٧٠

٢١- تۆفیق قەفتان . مێژووی حوکمدارانی بابان . بەغدا ١٩٦٩

٢٢- جەمال نەبەز . خوێندەواری بە زمانی کوردی . بەغدا ١٩٥٧

٢٣- دەستنووسی لێکچەرەکانی گۆران دەربارەی کێش و قافیەی کوردی .

٢٤- گۆڤار و ڕۆژنامەی کوردیی جیاجیا : بلێسە . ڕۆژی نوێ . هیوا . روناهی . برایەتی . زانیاری . دەفتەری کوردەواری

## بە عەرەبی :

١- الامیر شرف خان البدلیسی . الشرفنامە . ترجمە ملا جمیل بندی ڕۆژبەیانی . بغداد ١٩٥٧

٢- محمد أمین زەکی . خلاصە تأریخ الکرد و کردستان . ترجمە محمدعلی عونی . الگبعە الپانیە . بغداد ١٩٦١

٣- محمد أمین زکی . مشاهیر الکرد و کردستان فی العهد الاسلامی . ترجمە الآنسە کریمتە . القاهرە ١٠٥٧

٤- محمد أمین زکی . تأریخ السلیمانیە . ترجمە و تعلیق محمد جمیل بندی ڕۆژبەیانی . بغداد ١٩٥١

٥- محمد القزلجی . التعریف بمساجد السلیمانیە . بغداد ١٩٣٨

٦- رحلە ریچ . ترجمە بهاوالدین نوری . بغداد ١٩٥١

٧- أنور المائی . الاکراد فی بهدینان . الموصل ١٩٦٠

٨- عصمت شریف .مسألە توحید اللغە الکردیە . بغداد ١٩٦٠

٩–میجر سون . رحله متنکر . ترجمه فؤاد جمیل . ١٩٧٠

١٠– ف . مینورسکی . الاکراد . ترجمه و تعلیق الدکتور معروف خزنەدار . بغداد ١٩٦٨

١١– الدکتور علی عبد الواحد واف . اللغه و المجتمع . القاهره ١٩٥١

١٢– الدکتور ابراهیم أنیس . فی اللهجات العربیه . القاهره ١٩٥٢

**بە فارسی :**

١- احسان نوری . تأریخ ریشه نژادی کرد . گهران ١٩٥٥

٢- م . أورنگ . کردشناسی . گهران ١٣٤٦

**بە ڕووسی**

١- ئی . پ . موچنیك . سەرەتای زمانەوانی . مۆسکۆ ١٩٦١

٢- أ . أ ریفورماتسکی . سەرەتای زمانەوانی . مۆسکۆ ١٩٦٧

٣- قەناتی کوردۆ گراماتیکی زمانی کوردی . مۆسکۆ ١٩٥٧

٤- تسوکرمان . دەربارەی گراماتیکی کوردی . مۆسکۆ ١٩٦٢

٥- خالید چەتۆ ییف . کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیتی . یەریڤان ١٩٦٥

٦- ت . ئەریستۆڤا . کوردی پشت قەفقاس . مۆسکۆ ١٩٦٦

٧- چەرکەزی بەکاییێف . زمانی کوردی ئەزربایجان . مۆسکۆ ١٩٦٥

٨- دوکتۆر مارف خەزنەدار . دەربارەی مێژووی ئەدەبیی کوردی . مۆسکۆ ١٩٦٧

٩- دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد . بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی کوردستانی عیراق . باکو ١٩٦٧

١٠- کەریم ئەیوبی . سمیر نۆڤا . دیالێکتی کوردی موکری لینینگراد ١٩٦٨

**هەروەها**

لـەم بارەيـەوە هەنـدێ ڕاوێـژی تايبـەتيم لەگـەڵ مامۆسـتايان دوكتـۆر ئـەمين موتابچی و سەلمان واسيتی و دوكتۆر ڕەحمان قاسملو كردووە .

## سەرەتا:

ساڵی ١٩٧١ کەکتێبی (سەرنجێ لەزمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی) چاپ کرا. یەکێتیی نووسەرانی کورد چەند کۆڕێکی بۆباس‌و لێکۆڵینەوەی ئەو کتێبە تەرخان کرد. ئەوەبوو بەرامبەر بەهەندێك رای ئەو کتێبە کەخۆی لەخۆیدا کەرەسەی موحازەرەکەی ئێمە بوو هاوەڵمان دکتۆر کەمال فوئاد موحازەرەیەکی لەو بارەیەوە داو ئەویش بوو بەکەرەسەی لێکۆڵینەوە.

یەکێك لەو تێبینیانەی پاش دوو موحازەرەکە بیستم‌و سەرنجی ڕاکێشام وتەی ئەندازیارێکی کورد بوو کەبۆهەموو کۆڕەکان هاتبوو. ئەو بیرووناکە کوردە ئەم ئەنجامەی دامێ کەووتی: موحازەرەکەی دکتۆر کەمال فوئاد زیاتر شێوەی باسی ئەکمادیمیی هەبوو بەڵام موحازەرەکەی تۆ زیاتر لەگەڵ واقعی ئەمڕۆی کۆمەڵەکەی ئێمەدا رێك ئەکەوێت.

رەنگە هەندێك کەس وابزانێ ئەم نرخ پێدانە لەڕادەی زانستیی ئەو موحازەرەیە دێنێتە خوارەوە بەڵام لای من ئەگەر ئەو نرخ پێدانە تەواوبێت ئەوا موحازەرەکەم بەباسێکی زانستیی تەواو دێتە پێش چاو. لێرەشدا وابزانم هەڵوێستێکی زانستیم هەیە لەگەڵ هەموو ئەو رشتەی بیرکردنەوەو فەلسەفەو ئایدیۆلۆژی‌یەدا دەگونجێ کەرێبازی نووسین‌و چالاکیی – زانستیی من‌و هاوبیرانی منە. ئەویش ئەوەیە کەزانستی‌و پراکتیك دووشتن بەشێوەیەکی تەواو تێك ئاڵاون‌و لەیەك جیاناکرێنەوە

هەر لەسەر ئەو بناغەیەش دەبێت هەموو باسێکی دیالێکتەکانی زمانی کوردی لەسەر بنەڕەتی یەکێتیی زانست‌و پراکتیك بێت بەیارمەتی لەم چەشنە کۆڕەی ئێستاماندا کەهەموو بەروبوومی باسکردن‌و لێکۆڵینەوەمان بۆ یەکخستنی پراکتیکی ژیانە لەگەڵ ئەو سەرچاوە زانستی‌یانەدا کەباس ئەکرێن.

مەیدانی پراکتیکی ئەم باسەمان  هەموو کوردستانی عیراقەو گرنگ بۆ بەشەکانیتری کوردستان دەداتو جوغزەکەشی زۆر فراوانەو کۆمەڵێکی زۆر لەنەونەمامانی نیشتمان دەکرێتەوە. لەبەر ئەمە خۆم لەهەندێ باسی وا دوور دەخەمەوە کەتەنیا تەماشای باری ئەکادیمی یا زانستیی باسەکە بکاتو هەوڵیش دەدەم کەئەم باسە دووبارە کردنەوەی ناوەرۆکی کتێبی (سەرنجێ لەزمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی) نەبێت بەڵکو تەواوکەری ئەو ناوەرۆکە بێتو شتی تازەی تێدابێت، کەبەتازە بێتە ژماردن بەڵام دیارە داوای ئەوە ناکرێت کەئەمەیان شتێکی جیاواز بێت لەو چونکە خاوەنیان یەك کەسەو زادەی یەك  بیرکردنەوەو جیهان بینین.

## دیالێکتەکانی زمانی کوردیو کۆسپو چارەسەرکردنیان

ئاشکرایە کەدیالێکت بەشێکە لەزمانو پێوەندی دیالێکتو زمان وەك پێوەندیی هەموو ئەو شتانەیە کەکەتیگۆری (مفهوم)ی گشتیو تایبەتی فەلسەفەیان بەسەردا دێتەدی.

ژیانو باری جوگرافیو مێژوویی و سیاسی کۆمەڵ دیالێکتی جیاجیا لەزماندا دروست ئەکاتو چەند بەشە دیالێکتێك لەیەك جیا دەکاتەوەو دیالێکتیتریان لێدروست دەکات. بەم جۆرە دیالێکتەکانی زمان لەگۆرانێکی بەردەوامی بێوەستاندان. تا زمان بمێنێت دیالێکتو بەشە دیالێکتی دەبێت بەڵام نەخشەی ئەم دیالێکتو بەشە بەردەوامو بەماوەی درێژ دێتە گۆرین (دەگۆڕێت)

کەواتە لەبەر رووناکیی ئەم راستی‌یەدا دروشمی یەکخستنی دیالێکتەکانی زمانی کوردی بەدروشمێکی شاکارو دوور لەزانستو لەهاتنەدی دێتە بەرچاو. ئەمە لەکاتێکدا کەپەیدابوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی لەگەڵ پەرەسەندنو بەرەوپێش چوونی ژیانو بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی نەتەوەی کوردا بەرەو پێشەوەو بەرەو تەواوبوون دەڕوات.

زۆرجار لەسەرەتای باسدا لەدابەشکردنی زمانی کوردی بەسەر دیالێکتو بەشە دیالێکتدا دەڕۆین، زۆرتر لەو بەشکردنەوە دەست پێدەکەین کەشەرەفخانی بتلیسی پیشانی داوەو

ئەوەمان لەبیر دەچێت کەئەحمەدی خانی لەڕووی دیالێکتەوە سێ رەگەز لەمەمو زینی خۆیدا دەبینێت.

بۆهتی، مەهمەدییو سلێفی هەن لەعلو هەنەك ژ زێرو زیفی. پاش ئەم دابەش کردنێکی ترمان هەیە. بەلام لەم رووەوە بۆئەوەی خۆمان لەپەلەکردنو لەدوورکەوتنەوە لەراستیولەپێڕەوی زانستی بپارێزین دەبێت هەندێك چاوەرێ بینو بەنووکی خامەیەك راستو چەپ خەت بەسەر دابەشکردنەکانی پێشوودا نەهێنین، چونکە دابەشکردنو جیاکردنەوەو ناسینی دیالێکتو بەشە دیالێکت زیاد لەوەی کەبناغەیەکی پتەوو قووڵی شارەزایی زمانو جیاکردنەوەی زمان لەدیالێکتی دەوێت.

هەروەها کارێکی چاپووکی لەمەیدانی کاردا دەوێت واتە بۆ زانایەك چوونە مەیدانی کار واتە چوونە ناو ئەو دیالێکتو بەشە دیالێکتانەی دەوێت.

لەم ڕووەوە پوختەترین کار بەڕای من دوو بەرهەمە گرنگەکەی چەرگەزی خدۆی بەکۆ (بەکایف)ە، کەلەبارەی دیالێکتی کوردی ئازربایجانو دەربارەی کوردی تورکمانستانی سوڤێتەوەن. هەروەك لێکۆڵینەوەی کەریمی ئەیووبیو سیمرنۆڤا لەبەشە دیالێکتی موکری نرخی تایبەتی خۆی هەیە.

ئەگەر مەکەنزی وەك ئەوان کورد بوایەو سەلیقەی جیاکردنەوەی بەشە دیالێکتەکانی سەلیقەی کورد بوایە ئەوا کتێبەکەی ئەویش نرخێکی گەورەتری ئەبوو. دیارە لێرەدا مەبەس ئەوە نییە کەکاری رۆژهەلاتناسیتر بەتایبەتی (ئۆسکەرمان) بخرێتە پشت گوێ. بەلام مەبەس لێرەدا کاری ناو مەیدانێکە کەتێکەڵ بەزانست بێت ئەمەش لەبەرهەمی (بەکۆ)دا ئاشکرایە.

ئەگەر توانای ئەوە هەبووایە کەچەند زانا بەو چەشنەی بەکۆ لەدیالێکتو بەشە دیالێکتەکانی کوردی بکۆڵنەوە ئەوا بەئاسانی نەخشەیەکی تەواوو عیلمیمان دێتە بەردەست. تا تەواوبوونی ئەم نەخشەیەش وریاییو هەست بەمەسئولیەتی دەوێتو ناشێ بێ ئەو کاری مەیدانە دەست لەدوا نەخشە بدەین کەئەوەی تۆفیق وەهبییەو بەرهەمی لێکۆڵینەوەی درێژی خۆیو گەلێك زانایتره تەنانەت ئەگەر رێگەم بدرێ ئەوا رێگە لەتۆفیق وەهبی خۆشی دەگرم رەنگە مامۆستای مەزنمان خۆی هاتبێتە سەر

ڕای تازه بەڵام ئەو بەڵگانەی ڕایان بەو گۆڕیوە دەبێ ببنە سەرەتاو، ڕوونکەرەوەی ئەو ئەنجامانەی بەئێمەی ڕادەگەیەنێت، بێینەوە سەر باسەکەمانو بڵێین.

تائێستا زۆر لەوانەی لەدیالێکتەکانی زمانی کوردی دواون هەر بەدوای ڕەگەزی جیاکردنەوەدا گەڕاونو زۆر دەربەستی ڕەگەزی یەکێتیو یەکگرتنو لەتەوارمی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودا بەیەکەوە لکانەوە نەبوون. بەڵام ئەگەر لەسەر بناغەی زانست تەماشای ئەم دیالێکتانە بکەین دەبینین هێندەی پێیان بڵێین چەند دیالێکتی زمانێك جیاوازن لەیەكو هێندە بەیەك زمانی چەند دیالێکتێ بناسرێن یەکن. ئەم جیاوازیو یەکێتییەش هەموو ڕەگەزەکانی زمان (فۆنەتیكو مۆرفۆلۆژیاو سینتاکسو لێکسیکا) دەگرێتەوە.

بۆنموونە ئەگەر (فۆنەتیكو گراماتیكو بنەڕەتی فەرهەنگ) بەبناغەی یەکێتیی زمان بزانین ئەوا پاش وردبوونەوەی تەواو دەتوانین بڵێین جیاوازیی دیالێکتەکانی زمانی کوردی لەم ڕەگەزانەی زماندا هەر هێندەیە کەناوی چەند دیالێکتی جیاوازیان لێبنێیتو زۆرجار ئەو جیاوازییە زۆر لەوە کەمترە کەلەدیالێکتەکانی زمانیتردا دەیبینین بەچەشنێك کەدەتوانین کورتەی ئەم جیاوازیانە لەچەند لاپەڕەدا بدەین بەدەستەوەو لێرەدا بۆنموونە لەهەندێ جیاوازیی نێوان دیالێکتی کرمانجیی ژووروو خواروو دەخەمەبەرچاو [1]

ئەگەر سەیری هەموو بەشەکانی ئەم دوو دیالێکتە بکەین دیمەنی جیاوازی (تیپ) یا گۆڕینی (تیپ) یك لەدیالێکتێکدا بە(تیپ)ێکی ناکوردی دەبینین – وەك لەهەندێ زمانی تردا دەیبینین [2]

---

[1] لەبەرئەوەی بۆ مەسەلەی کتێبی خوێندن باری قورسمان هەر لەیەك گەیشتنی هەڵگرانی ئەم دوو دیالێکتەیە لەبەرئەوە زیاتر باسی ئەم دووانە دەکەین.

[2] بەڵێ هەندێ تیپی عەرەبی هاتۆتە کوردییەوە بەڵام ئەمە لەهەموو دیالێکتو بەشە دیالێکتەکاندا دەبینرێت تەنانەت دەتوانین ئەمە بە(دیمەنێکی دەنگی) یا (تلفظ) دابنێینو ئەو تیپانە بەنووسین تۆمار نەکەین وەك پەیدابوونی (ص) لە(سەد، سەگ.. هتد) یا (ط) وەك (تاری، سووت، شەوتی.. هتد) یا (ڨ) تەنانەت (ع) وەك ئەوەی ماردەبێت بە(مەعر) .. هتد، ئەم دیمەنەش لەکرمانجی ژووروودا زۆرترە.

گەورەترین گۆڕین ئەوەیە کەهەندێ (و) دەبێت بە(ڤ) ( دەڵێم هەندێ هەموو نا) بەڵام چ (و)و چ (ڤ) لەهەردوو دیالێکتدا هەن ئەوەندەی هەیە کە(و) لەژووروودا زۆرترە لە(ڤ) و بەپێچەوانەوە ئەمەش وەك هەندێك دەڵێن نزیکی فارسی نییە چونکە هەر ئەو (ڤ)یە کەلێرەدا بۆتە (و) لەفارسیدا (ب) یا (م)ە.

بەڵام لەڕووی فۆنەتیکەوە مەسەلەی هەندێك تیپی دەنگدارو هەندێ دەنگمان هەیە بۆ نمونە (و)و (ێ).

زۆرجار بەرامبەر بەچەشنە (و)وێك یا(ی) یەك دەوەستین‌و دەپرسین کام چەشنی بەکارهێنان یا نووسینی راسترە ئەوەشمان لەبیر دەچێت کەزۆر لەم (و)و (ێ)یانە لەگەڵ درێژبوونەوەی زەویی کوردستاندا بەرە بەرە دەگۆڕێن‌و (و) دەبێت بە(ی)و بەپێچەوانەوە، لەنێوان (و)و (ی)کەشدا گەلێك دەنگ هەیە کەپلەی گۆڕینە، بۆنموونە.

هوون (هەورامی) – خوون- خوێن – خین-

هوور- هویر- هیر (ورد یا هورد)

زوو – زی

مووس – (مووسا) موس- مویش- میس

هەروەها هەندێك دەنگ یا تیپ تەواو بچووك دەبێتەوە وەك وشەی (یەك) گەجیاکەرەوەی کۆو تاکە لەکوردیدا، کوڕ – یەك کوڕ – کوڕیەك- کوڕێك- کوڕەك.

جار جارێك – لەبۆتان دەبێت بە(جارەك)

مولك‌و مەلەك‌و فەلەك ب جارەك      القصە تە چێکرن تەبارك (خانی)

هەروەك ئەو (ە) تەواو وتراوەی هەندێ ئامراز لەکرمانجیی ژووروودا یا شێوەی فەتحەیەکی عەرەبی دەگرێت یا نامێنێت.

بەجارێك – ب جارەك

لەناو ئێمەدا – دنێڤ مەدا

لەتۆی دەستێنم — ژ تەدەستینم [٣]

بەم چەشنە دەتوانین گەلێك نموونە بۆ ئەم جیاوازیانە بهێنینەوە بەڵام لەوەش دڵنیاین کەلەم سنووره ناچنە دەرەوەو ئەوەندەش جیاوازنین کەببنە هۆی بەدرەنگ لەیەکتر گەیشتن.

لەڕووی مەرفەلۆژیاوە گەورەترین جیاوازی لەجیاکردنەوەی راناوو لەئیزافەدا دەبینین. شتێکی دیارە کەلەکرمانجیی ژووروودا دوو جۆرە راناو هەیە. ئەوەی لەگەڵ فرمانی تێپەڕداو ئەوەی لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕدا. گۆڕانی ئەم فرمانەش تارادەیەك کاردەکاتە سەر (سینتاکسیس)و شتێك لەریزکردنو دارشتنی رستە دەگۆڕێت.

هەروەها لەکرمانجی ژووروودا شتێك لە(ئیزافە)دا دەگۆڕێت ئەویش تەنیا لەئیزافەی تاکدا کە(ئەلف) بۆ مێو (ێ) بۆ نێرینە بە کاردێت [٤]

---

[٣] لام وایە کەئەم (ژ)ەیە لەگەڵ (جە) ی هەورامیدا یەکن:
لەدڵدا — جە دڵدا

[٤] ئەوانەی جیاوازی نێوان دیالێکتەکانی زمانی کوردی گەورە ئەکەن مەسەلەی جیاکردنەوەی نێرو مێیان زۆر گەورە کردووەو خستوویانەتە ئەو قالبەوە کەلەکرمانجی ژووروودا نێرومێ هەیە. لەکاتێکدا کەلەهەموو دیالێکتەکاندا چەشنێ لەجیاکردنەوە هەیە وەك ئەوەی لەدیالێکتی گۆرانیشدا راناوی کەسی سێیەمی تاك جیایە بۆ نێر (ئاد- بەدالی سلێمانی)و بۆ مێینە (ئادە- بەدالی سلێمانی) بەکاردەهێنرێت کە لەکرمانجیی ژووروودا (وی) بۆ نێرینەیەو (وێ) بۆ مێیینەیە.
هەروەها لەدیالێکتی گۆراندا گۆڕینی فرمانیش بەپێی فاعیلەکە نێر بێت یا مێ دەگۆڕێت.
لەهەردوو دیالێکتی کرمانجی خواروو ژووروشدا ئیشارەتی بانگ کردنی نێرینە لەئیشارەتی بانگ کردنی مێینە جیایە.
بەلای منەوە جیاکردنەوەی نێرینەو مێینە لەهەموو کوردیدا هەیە. بەڵام لەبەرئەوەی ئامرازەکانی ئامرازی نێرینە یا مێینە نین بەڵکو ئامرازی ئیزافە یا بانگ کردنو ئەو ئامرازانە بەشێك نین لەوشەکە وەك لەزمانی تردا دەبینین لەبەرئەوە لەوانەیە لەگەڵ زەماندا نەمێنێت.

هەروەك ئیزافەی (كۆ) لەهەربەشێ لەبەشەكانی كرمانجیی ژووروودا چەشنێكەو تێكڕاش لەكرمانجیی خواروو ناچێت [٥]

هەروەها فرمانیش هەروەك بەپێی جۆری راناوەكە لەگۆرین – تصریف –دا دەگۆرێت، جاروبار پریفیكس (پێشگر) یش جیاوازەو دەتوانین بڵێین زۆر هۆ وای كردووە كەژمارەی پێش گر لەكرمانجیی خوارووا زۆرتر بێتو بەو پێیە فرمانیش مانای زیاتری بێتو گۆرینی زیاترو فراوانتری هەبێت.

ئەوەی زۆر باس دەكرێت پێش گری (دە)یە كەلەسلێمانی بووە بە(ئە) و ئێستا هەر لەبەر یەككرتنو نزیكبوونەوە تەنانەت لەنووسینی نووسەرانی سلێمانیشدا دەبێتەوە بە(دە).

هەندێك جار باسی ئامرازی (ڤە) دەكرێت كەلەكرمانجیی خوارووا (وە)یە. ئەم ئامرازە بەلای منەوە بۆ دووبارە كردنەوەی فرمانە یا بڵێین بۆ ئەو فرمانانەیە

---

باسی ئەوەی كەنێرینەو مێینە لەزماندا چۆن پەیدابووەو باری ئێستای زمانی كوردی پێشبینی لەمەودوای كەرەسەی باسێكە كە هیوادارم پێشكەش بەزانایانی كوردی بكەم. بەڵام پێشەكی دەبێت ئەوە بڵێین كەئەم مەسەلەیە یا ئەم جیاوازییە هێندە گەورە نییە كەزمانەكەی پێ بەدوو زمان بزانرێت.

[٥] وەك دەزانین لەكرمانجی خوارووا تاكو كۆ لەباری ئیزافەدا هەر (ی) یان دەچێتە سەر وەك:

كوری من – كچی من.

كورانی ئێمە – كچانی مە. بەڵام لەكرمانجیی ژووروودا دەگۆررێت:

كورێ من_ كچا من

كورێد مە_كچێد مە

هەروەك ئەم (داڵە لەرووی فۆنەتیكەوە ناوچە بەناوچە وادەگۆرێت تا لەهەندێ ناوچەدا دەبێت بە(ت)و لەنێوان (د-ت)دا دەنگی ناوەراستیش هەیە هەروەك لەبەشە دیالێكتی بۆتاندا ئەم (ێد)ە دەبێت بە(ین)

كورێن مە

كچێن مە.

کەلەبزووتنەوەیەك (حەرەکەتێك) زیاتریان تێدایە. ئەمە لەهەردوو دیالێکتدا هەریەکەو گۆڕینەکە لەخانەی فۆنەتیکدایە، واتە گۆڕینی (واو) و (ڤ) یە ئەگەر لەزۆر فرمانی کرمانجیی ژووروودا بەپێچەوانەی کرمانجی خواروو ئەم ئامرازە لەپێش فرمانەوە بێت ئەوا فرمانی واش کەم نییە کە(ڤە) کە کەوتۆتە پشت فرمانەکەوە وەك: دێمەڤە.. کەنگی دچیڤە.. هتد.

هەر لەم باسەدا دەتوانین لەفرمانێك بدوێین کەفاعیلی دیار نییە (مجهول) وەك دەزانین لەکرمانجیی خوارووا ئەم چەشنە فرمانە بەیەك وشە یان بەیەك فرمان دەگۆڕێت وەك:

نووسرا – کوژرا- خورا.

بەلام لەکرمانجی ژووروودا فرمانی یاریدەدەر هەیە کەلەگەلێك زمانی تریشدا هەیەو ئەم فرمانانە ئەم شێوەیە دەگرن.

هاتە نڤیسین – هاتە کوشتن- هاتەخوارن.

تێتەنڤیسین- تێتە کوشتن- تێتە خوارن [٦]

ئەمەش دیسان شتێکی وانییە کەبەجارێك لەکرمانجیی خوارووا نەبێت چونکە لەوێشدا لەژماردن نایەت یا نایەتە ژماردن گەلێك شتیتر دەبینین.

لەرووی وشەو بناغەی فەرهەنگیشەوە (لێکسیکا) نیسبەتی ئەو وشانەی کەیەك نین شتێکی زۆر کەمن لەچاو یەکێتیو هاوبەشیی وشەی نێو دیالێکتەکانی کوردیدا ئەو وشانەش کەیەك نین بەشێکی زۆریان ئەو پێرەوە جیاوازییان بەسەردا دێنن کەلەناو دیالێکتی جیاوازی هەموو زمانێکدا هەیەو رەنگە بتوانین بیانکەین بەچەند بەشەوە:

١. هەندێك وشە کەتەواو موڵکی ئەو دیالێکتەیەو پێوەندی دیالێکتیتری بەسەرەوە نییە. ئەمەش یاپاش جیابوونەوەی مێژوویی هەلگرانی دیالێکتەکە کەلەکۆمەڵە

---

[٦] تێتە - دێتە

خەڵکی سەرەتایی نەتەوەکەیان دروست بووە یا وشەی کۆنی ئەو کۆمەڵە خەڵکەیەو تەنیا لەم دیالێکتەدا ماوەتەوە.

ئەم چەشنە وشەیە لەشێوەی هاوجۆر (مرادف)داوردە وردە بەشی زۆریان دەبن بەموڵکی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو.

٢. هەندێك وشە کەلەڕواڵەتدا دوو وشەن بەڵام لەراستیدا هەریەکن، بۆنموونە، بەرامبەر بە(الجالس)ی عەرەبی لەژووروودا دەڵێین:

روونیشتی. لەخوارووودا دەڵێین. دانیشتوو. ئەم دوو وشەیە لەبنەڕەتدا دوو وشەنین‌و هەریەك وشەن. بەڵام پێشگری (دا)بووە بە(روو)، وەك هەموو وشەی ترو زۆربەی (ئیسمی فاعل) (واو)بووە بە(ی) لەم بابەتەش لەناو هەردوو دیالێکتەکەداو لەدیالێکتەکانی تری کوردیدا زۆرە.

٣. هەندێك وشە کەجیاوازن تەنیا پاش وپێش خستنی تیپەکانی وشەکەیە بۆنمونە:

| ژووروو | خواروو |
|---|---|
| نك | کن |
| ئال — | ئالی لا |
| بەرف | بەفر |
| خیز | زیخ[٧] |

ئەم پاش‌و پێش خستنەش دیمەنێکە لەتاقە دیالێکتێکیشدا یا لەبەشە دیالێکتیکدا یا تەنانەت جاری وا هەیە لای کەسێك دەبینرێت بۆ نموونە، زۆر کەس جاری وا هەیە دەڵێت:

[٧] وشەی زیخ لەکرمانجیی ژوورووودا بەمانای ئازا، زیرەك بەکاردێت. خیز بەمانای (زیخ)ی خواروو یا (حصو)ی عەرەبی.

دەفرێت

جاری واش هەیە دەڵێت

دەرفێت

٤. هەندێك وشە لەدوو دیالێكتی زمانێكدا یا لەدوو زمانی یەك گروپدا — لەتیپدا- هەر یەكن بەڵام بۆ دوو مانای جیاوازی لەیەك نزیك بەكاردەهێنرێن‌و وەك بڵێین.

وشەی (زۆر) لەخواردوودا مانای (گەلێك) یا (كبیر) ی عەرەبیی هەیە هەر لەم وشەیەوە (بەزۆر) جێگەی (بالقوە) ی گرتۆتەوە. بەڵام وشەی (زۆر) لای كوردی سۆڤێتی (یاهەكاری) مانای (گەورە، مەزن، بەتوانا) دەگرێتەوە وەك (تە مرۆڤەك زۆری — واتە- تۆپیاوێكی گەورەیت)

٥. ئەو وشانەی پاش دووا جێگیربوونی جوگرافی لەزمانی بێگانەی نزیكەوە هاتوونەتە دیالێكتێكی كوردیەوەو هەندێكیان وەك خۆیان بەكاردەهێنرێن‌و هەندێكیان لەگەڵ زمانی كوردی‌و باری فۆنەتیكیدا هەڵسورێنراون.

زۆربەی ئەمانەش لەگەشەسەندنی دوا رۆژی زمانی ئەدەبیی یەكگرتوودا دووردەخرێنەوە.

بێگومان كەهەوڵی ئەوە ئەدەین جیاوازی ئەم دوو دیالێكتە لەم چەند دێرەدا كۆبكەینەوە. مانای وانی‌یە كەزۆر بەئاسانی‌و ساكاری دەروانینە ئەم جیاوازی‌یەو لامان وایە كەهێندە كەم‌و ئاسانە كەبەچەند رۆژێك ناهێڵرێت بەڵكو مەبەست لێرەدا ئەوەیە كەلەباری سەرنجی یەكگرتنی زمانی ئەدەبی‌یەوە بروانینە ئەو جیاوازیانەو باوەڕمان بەوە هەبێت كەدەتوانین لەدوو پلەی خوێندندا وا لەقوتابی بكەین دەسەڵات بەسەر ئەو جیاوازی‌یانەدا پەیدا بكات.

دیارە كەپەیدابوونی دیالێكت‌و بەشە دیالێكتی جیاواز زادەی باری جوگرافی‌و كۆمەڵایەتیی نەتەوەیەو وەك وتمان ئەو بارە ئەگەر دوو دیالێكتیش یەك بخات ئەوا لەتاقە دیالێكتێك دووی تازە دروست دەكات.

پەیدابوونی زمانی ئەدەبی یەکگرتووش یەکێکە لەوپێویستیانەی باری کۆمەلآیەتی نەتەوە (بەباری سیاسیەوە) دروستی دەکاتو هەر ئەو بارەش وادەکات کەرەگەزی دیالێکتێك یا بەشە دیالێکتیك کەزروف پەیدا بوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو لەناو ئەوانەوە دەستی پێکردووە لەناو زمانی ئەدەبیدا زیاتر بێت.

باری سەختی چەند سەدەی ژیانی نەتەوەی کورد وایکردووە کەئەو دەستپێکردنانەی لەمەوپێش هیچیان نەگەنە ئەنجامو ئێستا دوا دەستپێکردن ئەوەی سەدەی نۆزدەهەمی سلێمانیە[٨] لەکاروباری بەرەوپێش چوونو تێکەڵ بووندابێت

ئێمەش لەقەوارەیەکی سیاسی ئەوتۆدا خەریکی نووسینو خوێندەواریو لێکۆلینەوەوو کتێب دانانین کەنزیکی ئەو دەستپێکردنەیەو زۆربەی ئەوانەی لەکاردان بەتەئسیری ئەو دەستپێکردنە هاتوونەتە کۆڕی ئەم کارەوەو بە تەجروبەیکۆمەڵەبووی ئەم سەدەیەی ئەو هەوڵدانە گۆشو پەروەردە کراون.

لێرەدا بەناچاری ئەو نموونەیە دووبارە دەکەمەوە کەلەکتێبی ناوبراودا باسم کردووە ئەویش ئەوەیە کەزمانی ئەدەبیی یەکگرتوو وەك سەچاوەی ئاو وایە لەجێگەیەکەوە دێتە دەرێو لەژێر زەویو بەسەر خاکدا دەڕواتو ئەگەر لەسەرەتادا دیمەنەکەی ئاوێکی ڕەوان بێتو لە($H_2O$) پێك هاتبێت ئەوا لەئەنجامی ئەو ڕۆیشتنەدا گەلێك شتو مادەی تازەی تێدا دەتوێتەوەو گەلێك مادەش دەنیشێت. کەبوونە رووبارێکی مەزنی واش کەبەشێکی گەورەی خاکی نیشتمان ئاو بدات ئەوا لەڕواڵەتدا هەر ئاوە بەلآم لەناوەرۆکدا گەلێك مادە تێکەڵ بە($H_2O$)ەکەبووە.

ئەگەر لەسروشتدا ئەم تێکەڵ بوونو ڕۆیشتنە بەئاسانی بڕوات ئەوا بۆ زمان، ئادەمیزاد ڕۆڵێکی گەورەی هەیەو دەتوانێت پەلەی لێ بکاتو ڕەگەزی دیالێکتیك لەزمانی ئەدەبی یەکگرتوودا زیادبکات.

---

[٨] لەکتێبی (سەرنجێ لەزمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی)دا باسی سێ دەستپێکردنەکەی پێشوو دەخوێنیتەوە کەبریتی‌یە لەلوڕیو گۆرانی (بەشی هەورامی)و کرمانجی ژووروو (بەشی بۆتان)

بەڵێ ئادەمیزاد ناتوانێت سەرەنجامی دوایی مێژوو بگۆڕێت بەڵام دەتوانێت ڕێڕەوی ئەو سەرەنجامە تیژڕەو بکات یا کۆسپی دواخستن‌و سستکردنەوەی لەبەردەمدا دابنێت.

ئەگەر باوەڕمان بەوە هەبێت کەکورد یەك نەتەوەیەو بەرەو هەموو چەشنە یەکگرتنێك دەڕوات‌و چاکەی کۆمەڵانی زەحمەتکێشی کوردیش لەویەکگرتنەدایە. دەبێت باوەڕمان بەوەش هەبێت کەزمانی ئەدەبی یەکگرتووش دێتە کایەوەو هەموو کورد وای لێدێت بەزمانێك بنووسێت‌و بخوێنێت‌و یەك زمان لەکاروباری ڕەسمیدا بەکاربهێنێت.

کەباوەڕمان بەم ڕاستی یەش بوو دەبێت بەجۆرێك بنووسین‌و هەوڵ بدەین کەلەگەڵ ڕێڕەوو سەرەنجامی مێژوودا بێت. دەبێت ببینە هەوڵدەری دروستبوونی زمانی ئەدەبی یەکگرتوو. ڕاستە کەبوونی قەوارەیەکی سیاسی یەکگرتوو زمانی ئەدەبی یەکگرتووش لەگەڵ خۆی دەهێنێت، بەڵام زۆر جار بزوتنەوەی نیشتمانی نەتەوەیەك پێش پەیدابوونی ئەو قەوارەیەی هەوڵی بۆدەدات. هەندێك بەش‌و دیمەنی دوارۆژی ئەو قەوارەیە بەرەبەرە دادەچەسپێنێت.

هەروەك لەمەیدانی شۆڕشی گەلانی جیهاندا دوو شت لەیەك جیادەکرێنەوەو کەتێگوریی (مفهوم)ی (گشتی)و (تایبەتی)ی فەلسەفەیان بەسەردادێتەدی. ئەویش بریتی یە لەدیمەنی لەیەك چووی هەموو شۆڕشەکانی جیهان‌و لەتەجروبەی تایبەتی هەر شۆڕشە، ئەوا ئەم بنەڕەتەبەسەر زمانی ئەدەبیی یەکگرتووشدا دێتە دی. چونکە ئەویش بەشێکە لەژیانی نەتەوەو ڕەگەزێکی گەوروی یەکگرتن‌و سەرکەوتنی نەتەوەیە.

شتی (گشتی)ی هەموو نەتەوەکانی جیهان ئەوەیە کەهیچ نەتەوەیەك لەسەر زەویدا نی یە بەدوو دیالێکت بنووسێت‌و بخوێنێت. کوردیش لەمەدا لەنەتەوەکانی جیهان‌و تەجروبەی مێژوو جیانابێتەوەو هەوڵدانی جیاکردنەوەی وەك هەموو هەوڵدانێك کەبەربەستی مێژوو بکات سەرناگرێت.

شتی (تایبەتی)ش تەجروبەی کوردە لەپێکهاتنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودا کەلەهەندێ سەرەتاو دیمەنیدا لەتەجروبەی هەندێك نەتەوەیتر دەچێت‌و لەزۆر یا لەوان جیایە.

ڕاستە کەزمانی ئەدەبیی یەکگرتوو لەگەڵ مێژوودا دروست دەبێتو شتێك نییە بەشێوەیەکی دەستکرد دەستەیەك یا چەند زانایەك دابنیشینو بڕیاری لەسەر بدەنو دروستی بکەن. بەڵام ئێمە ئێستا واین لەبەردەمی تەجروبەیەکی تازەدا کەوەڵامو کرداری دەوێتو دەبێت وەڵامو کردارەکەمان لەگەڵ ئەو دروستبوونە مێژووییەدا یەك بێت کەتێی دەگەین.

سێ ساڵە خەریکی دانانو وەرگێڕانی کتێبی کوردین کتێبی وا کەبۆ هەموو کوردستانی عیراق دەست بدات لەکوردستانی عیراقیشدا بەشی زۆری دیالێکتو تەنانەت زۆربەی بەشە دیاێکتەکانی کوردیش کۆبۆتەوە.

هەر لەسەرتاوە بەڕێوەبەریی خوێندنی کوردی بەکردار وەڵامێکی دایەوە کەلەگەڵ دروستبوونە مێژوویەکەدا یەك دەگرێت.

یەك کتێب بۆ هەموو قوتابی کورد مەردانە بەرامبەر بەبیری دوو کتێبو سێ کتێب وەستا.

بەڵام ئەو یەك کتێبە دەبێت چۆن بێت.

کاتێك کەبیری موتوربەکردنی کرمانجیی خواروو هاتە کایەوە زۆر کەس بەرامبەری وەستا بەڵام رەنگە بەرامبەر وەستانەکە رەنگی جیاوازی هەبێت.

هەندێك لەجەوهەردا زمانی کوردی بەیەك زمان نازانن و هیوای جیاکردنەوەیان هەیەو جاروبار ئەم رایە دەردەبڕنو جاوربار لەژێر پەردەی لەیەکتر نەگەیشتندا دەیشارنەوەو داوای دوو جۆرە کتێب دەکەن کەدیارە ئەمە سەرەتای جیابوونەوە گەورەکە دادەنێت.

هەندێك لەکونجی بیرکردنەوەی ئەکادیمییەوە دوور لەباری ژیانی تایبەتیی کورد بڕیاری ئەوە ئەدەن کەزمانو زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو دروست ناکرێتو ئەم کارە لەشێوەیەکی بەرەڵلا دەدەنە دەست کاتو رۆژو دەربەستی ئەوە نین کەئەو کاتو رۆژە وابکات کورد بەسێ چوار جۆر بنووسینو بخوێنن.

کەسانیتر کەلەگەڵ موتوربەکردندان ئەوانەن کەدەیانەوێت ئەم تێکەڵیە بەشتێکی میکانیکی دانەنێین. بەڵکو بیکەین بەکارێکی زیندوو کەلەگەڵ بەرەو پێش چوونی زمان‌و پەرەسەندن‌و هەموو کوردستان گرتنەوەی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودا بگونجێت.

لەکاتێکدا کەئەم ڕایە پەسەند دەکەم مانای وایە کەلەگەڵ بیری تێکەڵ کردندام‌و لەگەڵ ئەوەشدا نیم کەئەم کارە بەئیشێکی ساکاری میکانیکی بزانین‌و ناوی بنێین موتوربەکردن ، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم بیرە دەبێت بڵێین:

ئەگەر پێش ساڵی ١٩٥٨ داوای دانان‌و وەرگێرانی کتێبی کوردی لەئێمە بکرایە لەنوسیندا هەر نەخشەی تێگەیشتنی قوتابیی سلێمانیمان لەبەرچاو دەبوو. پاش ١٩٥٨ قوتابیی کەرکوك‌و خاکی سۆران( هەولێر) هاتە ناو ئەو نەخشەیەوە. بەڵام پاش ١٩٧٠ دەبێت قوتابی بادینان‌و زاخۆو شنگارمان لەبەرچاوبێت [٩]

ئەم لەبەرچاوبوونە ئەوە ناگەیەنێت کەنووسینەکە بکەین بەشتێکی تێکەڵی لەهیچ نەچوو. هەروەك نابێت بەهیچ جۆرێك ئەو هەوڵ‌و ڕەنجەمان لەبەرچاو نەبێت، کەسەدەیەك زیاترە لەگەڵ ئەو زمانە ئەدەبی‌یەدا دەدرێت کە ئێستا بووە بەزمانی ئەدەبیی هەموو ئەوانەی بەکرمانجیی خوارووو بەشێك لوڕی‌و گۆرانی دەدوێن. لەبەرئەمە لەو زمانە کوردی‌یە ئەدەبی‌یەدا کەبۆ کتێبی ئەمڕۆی قوتابخانەکانی کوردستانی عیراق بەکاردەهێنرێت دەبێت ئەم خاڵانە ڕەچاو بکەین:

١. ئەو هەوڵ‌و تەقەللایەی ئێستا دراوەو ئەو ئیستیلاحاتەی لەم نیوە سەدەیەدا لەکوردستانی خواردوودا جێی خۆی گرتووە نابێت دەستیان لێ بدرێت، بەدەگمەن‌و لەحاڵی شتی باشتر دۆزینەوەدا نەبێت.

---

[٩] هەرچەندە ئەوانەی بەدیالێکتی گۆران دەدوێن‌و ئەو بەشە لورەی لەعیراقدان وەك ناوچەی ژووروو مەسەلەی جیاکردنەوەی زمانی قسەکردن لەزمانی ئەدەبی یان سەلماندووەو بیرووناکەکانیان مەردانە هەوڵی چەسپاندنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوویانە بەڵام زمانی ئەدەبی دەوڵەمەندکردنمان بەبەشداریی دیالێکتەکانی ئەوان نابێت لەبیر بچێت.

٢. چاوێکی باش بەو هەوڵو تەقەللاو ئیستیلاحاتانەدا بخشێنرێتەوە کەلەم ماوەیەدا لەسوریاو لوبنانو لەسەر لاپەڕەکانی (هاوارو ستێرو ڕۆژی نوێ.. هتد) هاتنە کایەوەو دەبێت هەنگاوەکانی ئەو جوامێرانە بەتایبەتی بەدرخان پێڕەوی ئەو کوردانەی ژوورو بێت کەئێستا دەست دەدەنە نووسین[١٠]

٣. لەقۆناغی سەرەتاییو ناوەندیو ئامادەییدا قوتابی فێری هەموو ئەو جیاوازییە گەورانە بکرێت کەلەنێوان دیالێکتەکاندا هەیەو داچەسپاندنو مانەوە یا بوون بەدوو ڕێگەی ئەم پێڕەوی سینتاکس یا ئەو بدرێتە دەست ڕۆژگار کەخۆی شتی باش دادەچەسپێنێت. هەروەها قوتابی لەم پلانەدا لەشێوەی هاوتا (مرادف) دا فێری سەدان وشەی تایبەتی دیالێکتو بەشە دیالێکتەکان بکرێت.

٤. کاتێك کەروودەکەینە کرمانجیی ژووروو دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت کەئەمرۆ تەجروبەی (موحافەزەی دهۆکی ئێستامان) لەبەردەمدایەو سبەینێ تەجروبەی هەموو کوردستانی تورکیامان دێتە بەردەم. تەنانەت بۆ ئەو کەسانەش کەسوورن لەسەر ئەوەی بەبەشە دیالێکتی بادینان بنووسن، دەبێت ئەوەیان لەبەرچاوبێت کەهیچ نەبێت فرمانێکی یەکگرتوو بۆ بەکرمانجیی ژووروو نووسین هەیەو لێرەدا هەر لەمەلای جزیرییەوە تا جەلادەت بەدرخانو قەدری جانو جگەرخوێن نموونەن. واتە دەبێت کۆتایی بەم بە(بادینانیو هەکاریو بۆتانی)و جیاکارییەی ڕادیۆکانی بەغداو ئێرانو ڕۆژنامەی هاوکاری بهێنرێت.

٥. هەرچەندە ئەم زمانە ئەدەبییەی ئەمڕۆ لەعیراقدا وا لەکاردا لەسلێمانییەوە دەستی پێکردووەو بەو پێیە ڕەگەزی سلێمانیی زۆر تێدایەو ڕەگەزی بەشە دیالێکتەکانیتری تێکەڵ بووە بەڵام لەهەنگاوی تازەی کتێبی قوتابخانەماندا دەبێت ئەوەمان لەبەرچاو بێت کەکرمانجیی خواروو بەشی (سۆران – موکریان) ناوەڕاستترە

---

[١٠] لەگۆڤاری (هاوار)دا تەواو هەست بەوە دەکەین کەهەولیان داوە لەتواناو بەپێی ئاگاداربوونو پێوەندی لەڕووی ئیستیلاحەوە لەگەڵ کوردی عیراقدا یەك بن. تەنانەت ماوەیەك بەلاتینی نووسینی گۆڤارەکەیان دواخستووە تا ئیملا لاتینییەکەی تۆفیق وەهبی ببینن.

لەنێوان (سلێمانی – سنە) و کرمانجیی ژووروودا ئەمەش جێگەی بەرچاوگرتنو سوود لێ بینینە.

ڕەچاوکردنی ئەم شتانە هەر بەوتەو بەکاری تاقە کەسی ئەمو ئەو نابێت بەڵکو دەبێت کەرەستەی بەردەست بۆ کتێب نووسو وەرگێڕەکان ئامادە بکرێتو ئەوەش بەکۆمەڵێك شارەزا ئامادە دەکرێت، بۆ نموونە :

دەتوانین لەماوەیەکدا رابەرێك بۆ کرمانجیی ژووروو یا دیالێکتەکانیتر دابنێین-کەزۆرتر باس لەجیاوازی بکات هەروەك دەتوانین لەماوەیەکی کەمدا فەرهەنگێکی وشەی هاوتا دابنێینو ئەمانە دەبنە کەرەسەیەکی باش.

ئەم رێگەیە رێی راستەقینەی کتێبی دوارۆژی کوردییە. رەنگە ئەم نووسەر لەو سەرکەوتووتر بێت یا ئەم کتێب لەویتر باشتر بێت بەڵام ئەمە لەجەوهەری مەسەلەکە ناگۆڕێتو وردە ئیش بەتێبینی زانایانو شارەزایان چارەدەکرێتو لێرەدا نووسەرانو توانادارانی بادینان جێگەو رۆڵێکی گەورەیان هەیەو دەتوانن ئەم کارو تێکەڵییە لەقاڵبی میکانیکیەوە بگۆڕنە سەر قاڵبێکی سەر بەژیانو پێشکەوتنو پەرەسەندنی منداڵی کوردی تێدا بێتو لەهەڵسەنگاندنی کتێبو زمانەکەیدا ئەوە رەچاو بکەن کەهەموو زمانێکی ئەدەبی لەگەڵ زمانی قسەکردندا جیایەو تەجروبەی هەموو گەلان ئەوەمان پێدەڵێت. لەبەرئەوە مەسەلەی جیاوازیی کتێب لەگەڵ قسەکردندا پڕ کۆسپەو نابێت گەورەبکرێت. هەروەك دەبێت ئەوەش لەبەرچاوبێت بەتایبەتی لەپلەی سەرەتاییدا کەقوتابی خۆی بەتەنیا لەناوەرۆکی کتێب ناگات با بەشە دیالێکتی خۆیشی بێت بەڵکو یاریدەی مامۆستای دەوێت، لەبەر ئەمە تێگەیشتنی قوتابیی مەرجی تەواویو ناتەواویی کتێب نییە هەروەك دەبێت ئەوەشمان لەبیر نەچێت کەقوتابی لەدیالێکتیتری زمانەکەی خۆی باشتر تێدەگات وەك لەزمانێکی بێگانە.

لێرەدا کۆسپێکی تر یا تێبینیەکی تر دێتەکایەوە ئەویش ئەوەیە کەقوتابی یا مامۆستای سلێمانیو سۆران ئەم چەشنە زمانە تێکەڵە بەرەوان نازانن، بەڵام دیسانەوە تەجروبەی گەلانو خۆشمان ئەوەمان بۆ دەردەخەن کەئەو زمانەی ئەمرۆ بۆ ئەو کەسانە رەوان نییە کەهەر بەبەشە دیالێکتی خۆیان راهاتوونو خوێندوویانە سبەینێ دەبێت

بەزمانی ئەدەبی‌و بەشتێکی ڕەوان‌و دەبێت هەموو کارمان لەپێش خستن‌و ڕێکخستنی هەوڵماندا دیاربێت.

ئەگەر بتوانین لەماوەیەکداو لەناو کتێبی قوتابخانەدا ئەم ئەرکە بەجێ بهێنین ئەوا نەوەیەك بیر ڕووناکی ئەوتۆ پێدەگەیێنین کەسامانێکی فراوانی وشەی کوردی هەمەڕەنگی لابێت‌و شارەزای جیاوازی دیالێکتەکانی زمانی خۆی بێت. ئەو نەوەیە ئەدەبیاتی تازە بەچەشنێك دەنووسێت کەشەقڵی هەموو دیالێکتەکانی پێوەبێت‌و دەوڵەمەندو فراوان بێت‌و بەراستی لەهەموو خاکی کوردستاندا بۆ زمانی ئەدەبی دەست بدات.

ئەمە ئەو ڕێڕەوەیە کەمێژوو خۆی بێپرس کردن لەئارەزووی ئەم‌و ئەو دایدەچەسپێنێت‌و ئەوەی بەپێچەوانەی مێژووەوە بڕوات جێگەی دیارە. ڕەنگە ئەم چەشنە کارە ، لەکۆڕی پەیدابوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوودابەرێگەی تایبەتیی زمانی کوردی بناسرێت بەڵام بە(گشتی) ئەمەش تەجروبەیەکە لەچوارچێوەی تەجروبەی گشتیی گەلانی جیهان ناچێتە دەرەوە.

بەم چەشنە سوود لەژیانی خۆمان‌و گەلان دەبینین‌و بەداچەسپاندنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو یا هەوڵدان بۆ چەسپاندنی ڕەگەزێکی گەورەی مانەوەو بەرزبوونەوەو پێشکەوتنی نەتەوەی کورد دادەچەسپێنێ‌و ئەمەش ئاوات‌و مەبەستی هەموومانەو لەگەڵ زانستدا دەگونجێ. چونکە زانست‌و ژیان لەیەك جیاناکرێتەوەو ئەو زانستەی خزمەتی ژیان‌و گەلان نەکات شتێکی تاقەوەبووی سیس بووی مردووەو بەشی نەمانە.(سیمیناری کتێبی خوێندن- شەقلاوە ۱۹۷۳) ۱۱ ی ئازاری ۱۹۷۰ ڕووداوێکی نوێ بوو لە مێژووی نەتەوەی کوردا. یەکەمجار بوو یەکێك لەو حکوومەتانەی پارچەیەك لە کوردستانی خراوەتە ژێر چنگ، ڕێکوڕەوان دان بە بوونی کورد و مافی نەتەوەییدا بێنێت و ئەو مافەش بخاتە چوارچێوەی دان نان بە ئۆتۆنومیدا و دەست بداتە ئەوەی ئەو ئۆتۆنۆمی‌یە لە ڕێی هاوکاریی ئاشتی‌یانەوە لەگەڵ سەرکردەیی و بزووتنەوەی نیشتمانی کوردەوە جێبەجێ بکات.

یەکێك لەو مافانەی کورد سەندی و هەندێك توانا بۆ جێبەجێکردنی بۆ کورد ڕەخسێنرا. مافی ڕووناکبیری بوو.

بە یەکدگیریەکی- تا ڕادەیەك باش و چالاکی دەستکرا بە بەدیهێنانی ئەو مافە و قووڵکردنەوە و فراوانکردنی باری زانستی و بیر ڕووناکیی کورد. ئەوەی پێوەندیی بە کاری بەرەو پێشچوون و بەرەو دروستبوونی زمانی ستانداردی نووسینی کوردییەوە هەبوو بە هەموو لایەکی ئەم چالاکییەوە دیاربوو. بەڵام لەبەرئەوەی لە پەنجا ساڵەی ڕابووردووا بەشە دیالێکتی سلێمانیی — کوردیی خواروو بناغەی زمانی ئەدەبیات و خوێندن و نووسین بوو و سەردەمێکیش بۆ کاروباری فەرمانڕەوایی بەکارهێنرابوو، لەبەرئەوەی بە بناغەیی مایەوە و بەرەپێشچوونەکەی بە تێکەڵکردنی ڕەگەزی (فۆنەتیکی و مەرفەلۆگی و لێکیسکا)ی بەشە دیالێکتەکانیتری کوردی خواروو و هەندێ بەشی کوردیی ژووروو بوو.

ئەگەر لە پلەی پێشوودا لە کونگرەی مامۆستایانی کوردا(ساڵی ١٩٥٩ لە شەقلاوە) بڕیارێکی تێکەڵکردن یاوەك ناونرا (موتوربەکردن) هەبووبێ. با ئەو بڕیارە بە چەشنێکی میکانیکیش (نەك دینامیکی) ڕوانیبێتە ئەو مەسەلەی تیکەڵکردنەی بە هەنگاو دەزانرا ئەوا بریارە کە لە جێی خۆیدا مایەوە و ڕێگە گرتن لە پەرەسەندنی ڕووناکبیریی کوردی ماوەی بەدیهێنانینەدا و زەمان بردیە ساڵانی (١٩٧٠-١٩٧٤).

١. لەم ساڵانەدا بە شێوەیەکی زیندووتر دەستکرا بەکار.

لە وەزارەتی کاروباری ژووروو- بەڕێوەبەریی خوێندنی کوردی- دەیان لیژنەی کتێبی قوتابخانە نووسینی پێکەوە نا. لەڕووی پەروەردەوە دەووترا:

با ساڵ بە ساڵ خوێندن بکرێت بە کوردی. بەڵام پەلەکردن لە بەکارهێنانی هەقێکدا کە سەندراوە وایکرد لە ساڵێکدا کتێب بۆ زوربەی ئەو زانیارییانە ئامادەبکرێت لە ١٢ ساڵی قوتابخانەدا دەخوێندرێن (چ بە وەرگێڕان یا دانان). لە لیژنەکانی کتێب ئامادەکردندا ئەگەر شارەزایانی هەموو دیالێکتەکانیشی تێدا نەبوو بێت، ئەوا نوێنەران یا هەڵگرانی ئەو دیالێکتانەیان تێدا بوو.

**ڕشتەی بەرەو ستاندارد چوون ئەم ڕێگەیانەی گرت.**

یەکەم: لە ڕووی (لێکسێك)وە بریار ئەوە بوو لە پێشدا هەر ووشەیەکی کوردی گشتیی دەست کەوێت ئەوە بەکار بهێنرێت، ئەگەر نەبوو ئەوسا لە دیالێکت و بەشە

دیالێکتەکانی تری کوردیدا بۆی بگەڕێین. ئەگەهەر نەبوو پەنا بەرینە بەر ئیستیلاحە لاتینیکانی یا زمانی دراوسی (بەلام رژێمی بەعس پاش ساڵی ١٩٧٥ بەکارهێنانی هەموو ووشەی نا کوردی و نا عەرەبیی لە نووسینیکوردیدا قەدەغەکرد- چ لە کتێبدا و چ لە رۆژنامەگەریدا) بەم چەشنە لەو چوار ساڵەدا گەلێك ووشەی تایبەتیی ناوچەکان بەرەو کوردیی گشتی هەڵکشان و بلاوبوونەوە.

دووەم: لە ڕووی فۆنەتیکەوە دیسان هەولی بەکارهێنانی کوردیی گشتی درا و لە هەندێك خاسیەتی تەسکی فۆنەتیکی خۆلادرا.

سێیەم: لە ڕووی مەرفەلۆگییەوە- دیسان کوردییە گشتییە کە وەرگیرا و هەندێك جار پەنا دەبرایە بەر هەندێ شێوەی جیا. ئەمە لە کاتێکدا کە لەهەر ئەم سێلایەنەدا هەولی تێکەلیش دەدرا و دەکرا لە یەك کتێب یا تێکستدا ووشەکان ببنە (سینۆنیمی یەك) و قوتابی فێری دیاردەی جیاوازی فۆنەتیك و مەرفەلۆگی سەر بە دیالێکتە جیاوازەکان بکرێت. بە تایبەتی لە کتێبەکانی (ڕێزمان- یا دەستووری زمان)دا، هەرچی ئەو بەشانە یا ئەو کتێبانەیە کە بۆ ئەدەبیات و خوێندنەوە دانران، ئەوەش بە چاوی یەکگرتوویی و بوونی یەك ئەدەبی کوردی و چەند هەڵقەی بەیەکەوە بەستراوەوە سەیری ئەدەبیاتی کوردی کرا. نووسەری ئەم چەند دێڕە، کە لیژنەی نووسینی بابەتی ئەدەبی کوردییان پێسپارد(لە پۆلی ٧ ەوە بۆ ١٢)، نووسینەکەی وایکردووە ئێستا هەموو قوتابیانی کورد کە پۆلی ١٢ هەم تەواودەکەن ئاگاداری هەموو ئەدەبیاتی کوردی بن (لە بابە تایەرەوە بۆ مەلای جزیری و خانی بۆ قوبادی و مەولەوی بۆ سالم و نالی و گۆران و جگەر خوێن و قەدری جان) و هەموویان بە مولکینەتەوەیی خۆیان بزانن. تەنانەت ئەگەر ئەو ڕێ و شوێنە بەردەوام بووایە ئێستا لە خوارووی کوردستاندا پشتێکی (نەوەیەکی) خوێندەوار پەیدا دەبوو کە باش شارەزای هەموو دیالێکتەکان بێت و ئەمەش لەکاری ڕۆژانە و حاڵ و باری نووسیندا ڕەنگ بداتەوە و هەنگاوێکی گەورە بەرەو زمانی ستانداردمان ببات. بەلام بەداخەوە ڕژێمی فاشیستی بەعس بە جۆرێك (کە باسکردنی لە دەرەوەی ماوەی لێدوانماندایە ئەو بزووتنەوە دینامیکییە و ئەو پێشکەوتنەی وەستاند)، کە مەودای خۆی لە فێرکردنی زانستگاشدا دەبینی و دوو بەشی کوردیی زانستگای بەغدا و سلیمانیش بە پێی ئەم چەشنە نەخشەیە کەوتنەکار.

هەر وەك وەزارەتی كاروباری ژوورو لە تەمموزی ١٩٧٣ دا هەر لە هاوینە هەواری شەقلاوە سیمینارێكی فراوانی بۆ بابەتی (كتێبی قوتابخانە) بەست لەوێدا نەخشەیەكی زانستی و واقیعی بۆ نووسینی كتێبی قوتابخانە دانرا، بە چەشنێك كە پرۆژەی بەرەو زمانی ستاندارد چوون پتەوتربێت بەلاَم دیسانەوە نەمانی باری ئاشتی و پەشیمانبوونەوەی رژێمی بەعس لەدان بە مافی كورددانان ئەم پرۆژە یەشی ڕاگرت.

٢- كۆڕی زانیاریی كورد پێك هات. (نووسەری ئەم دێڕانە ، لە كاتێكدا كە دان بە هەندێك هەڵچوونی لاوێتیدا دەنێ، دەربارەی ئەو كۆڕە بەلاَم هەندێك تێ بینیشی هەرماوە)، بە هەموو حاڵ ئێستا كە وەك مێژوو دەڕوانینە ئەو ڕۆژانە، دەبینین كە كۆڕی زانیاریی كورد لەو ساڵانەدا كۆششێكی زۆری كرد و بەرهەمی باشی هەبوو. هەرچی پێوەندیی بە مەسەلەی زمانی ستانداردەوە هەیە. ئەوە زانیاریی ( هەژاری موكریانی)و شوێن پەنجەی وەك لە كتێبی قوتابخانەدا دیار بووە بە كارەكانی كۆڕی زانیاری كوردەوە كۆششی ئەو و (شوكر مستەفا و عبدالرحمن زەبیحی) ش زۆر دیاربوو. ئەم كارە ووشە و دانانی ئیستیلاحی جیاجیای بۆ زۆر زانست گرتەوە كە ڕێگەی گشتیان لەگەڵ ئەوەی كتێبی كوردیدا یەكبوو لە لایەكی ترەوە چاپەمەنیی كۆڕی زانیاری هەموو گۆڕەپانی كوردیی گرتەوە بە درێژایی مێژوو و بەرەو بەرهەمی هەموو دیالێكتەكان و هەموو ناوچەكان و كاری نووسراو بەرهەمی فۆلكلۆریی دیالێكتەكانیش بلاَودەكرانەوە. پاش ساڵی ١٩٧٤- كۆڕی زانیاریی سەربەخۆش نەماو كۆسپ هاتە ڕێگەی كارو چاپەمەنیی ئەو دەستەی كوردییەش كە جێیگرتەوە.

٣- هەر شیعر و ئەدەبی كوردیش لەو سەردەمەدا گەشەیەكی زۆری لە ناوەڕۆك و ڕووخسار و زماندا دی. بەرهەمی فۆلكلور بە كۆكردنەوە و ڕووتیكردن و لێهەڵێنجانەوە تێكەڵ بە ئەدەبیاتی سەردەم بوو (بە شیعر و چیرۆكیشەوە). گۆڕەپانی بەرهەمیش هەموو خوارووی كوردستانی گرتەوە و چالاكیی شاعیر و نووسەرانی ناوچەكانی تریش كە ئەو سەردەمە لە عیراق بوون دیاربوو. یەكێتیی نووسەرانی كورد هوشیارانە و چالاكانە ئەم بزووتنەوەیەی ڕێك دەخست. بێجگە لە گۆڤارەكەی – كۆڕی ئەدەبیی هەفتانە لە شارەكانی خوارووی كوردستاندا و بیستنی شیعر و چیرۆكی هەمەڕەنگ و هاتوچوی شاعیران و نووسەران لە نێوان شار و شارۆچكەكاندا گوێی

خەڵکی بادینان و سۆران و سلێمانیی بە بەرهەم و بە دیالێکتی یەکتر ئاشنا دەکرد و گوێگرتن لە نووسەرە لاوەکانی یەزیدیش گوڕی دەدا بە پرۆسێسێکی نوێ. پێشتر لە خوارووی هەر سلێمانی بە مەڵبەندی شیعر و ئەدەب دەزانرا، بەڵام لەم ماوەیە بەولاوە دەنگی شیعری کوردی و تا ڕادەیەك لە هەموو کونجێکەوە دەبیستra، بە تایبەتی لە میهرەجانی شیعری کوردی لە بەهاری ۱۹۷۳ دا لە شاری کەرکووك دەردەخست.، ڕاستە ئەم چالاکی‌یە نووسینی بە دوو دیالێکت دەردەخست

بەڵام لەو سەردەمەدا لە هەموو پرۆسێسەکەدا دوو دیالێکتە کە وەك هاوتەریب (پارالیل) خۆیان پیشان نەدەدا. بەڵکو سیمای لە یەکترنزیکبونەوە و تێکەڵی دیاربوو . چوونەوە سەرفۆلکلۆر بەفراوانوەك زمانی دەوڵەمەند دەکرد یارمەتیی ئەو تێکەڵی‌یەشی دەدا.

کە ساڵی ۱۹۸۳ یەکێتی نووسەرانی کوردیش داخرا. ئیتر ئەو چالاکی و بۆچوونەش نەما. تەنانەت دوور لە ڕەوشتی ڕۆژنامەگەریی کوردی- لەسەرەتایەوە، بەرامبەر بە دیالێکتی جیای کوردی، دوو ڕۆژنامە دەرچوو: (( ئاسۆ و بزاڤ)) یەکەمیان دەبوو بە دیالێکتی خواروو تێیدا بنوسرێ و دووەمیان بە کوردیی ژوروو لێیان قەدەغەکرابوو بە دیالێکتەکەی تر شت بلاوبکەنەوە. دستگاکانی ڕژێم کەوتنە باسی ((کەلچەرێکی یەکگرتووی عیراقی))کە بە دوو زمانە. لە کاتێکدا مێژوو جیاوازیی کەڵچەری کوردی لە عەرەبی دەسەلمێنێ.

لەو چوار ساڵەدا کە خوێندنی کوردی لە ناوچەی سلێمانی و بەشێ لە سۆران دەرچوو، بەرەو بادینان و بەشێ لە هەکاری و بۆتان و بەرەو هەموو سۆران و کەرکووك و گەرمیان و خانەقین و قزرابات.

ئەو چەشنە کتێب و خوێندنەش تێکەڵ بە بەرهەمەکانی ڕۆژنامەگەری و چالاکی‌یە ئەدەبی‌یەکە، دیمەنی پەیدابوونی زمانێکی تێکەڵی لە کتێبی خوێندن و تەنانەت ئەدەبیاتیشدا دەردەخست کە پرۆژەیەکی باش بێت بۆ تێکەڵبوونێکی تر لەگەڵ کوردیی ژووروودا بەرەو زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو یاستاندارد لە کاتێکدا داگیرکەر ئەم کۆششانەی بەو جۆرە ڕاگرت. ئەوەتا لە باشووری کوردستاندا ئێستا ئەم

دەرفەتە سیاسیيە گەورەیە هەیە(فیدرالیيەك كە لە پراكتیكدا سەربەخۆییيە —حكوومەت و پەرلەمان) ئەگەر زۆر كۆسپ لە ڕووی سیاسی و ئابووریدا لەبەردەمدا بێت. ئەوە ئەو بەشەی ڕووناكبیری كە بەدەست خۆمانەوە یە دەرفەتێكی نوێمان دەداتێ. كە بە نەخشەیەكی زانستی بەرەو لە دایكبوونی زمانی ستاندارد بچین. دیارە دیالێكتی جیا هەر دەمێنێ بەلام نەتەوەی كورد ڕێگە نادات كەس بە دوو یا سێ نەتەوەی دانێت. یەك نەتەوەش —هەر دەبێ یەك زمانی نووسین و خوێندن و ئەدەبیاتی هەبێت، كە مێژوو خۆی دروستی دەكات و دەبێ كۆششی زانستیی زانایان و بەرهەمی نووسەران بە هوشیاریيەكی سیاسیيەوە بچێتە ناو تەوژمی مێژووەوە. سیمای زمانی ستانداردی كوردی لە شێوەی تێكەڵدا دەبینم تێكەڵیيەكی سروشتی و مێژوویی سەر بە هەموو دیالێكتەكانی ئەو نەتەوەی كوردەی خۆی بە یەك نەتەوە دەزانێ و خاوەنی یەك زمانە و دەبێ یەك دەوڵەتی هەبێت.

( لە سیمیناری زمانی كوردی بەرەو ٢٠٠٠ لە ساڵی ١٩٩٢ دا لە پاریس خوێندراوەتەوە ) .

(سۆرانی...لە سیمیناری زمانی کوردی بەرەو ساڵی ۲۰۰۰
-پاریس ۱۹۹۳)

ئەگەر لەکەرەسەی ڕۆژنامەگەریداو بەسەر زمانی خەڵکەوە ئیستیلاحەکانی مەیدانی دیالێکتو بەشە دیالێکتەکانی کوردی بەهەڵە بەکاربێت ئەوا کاتی ئەوە هاتووە کەلەم سیمینارەوە بریارێکی زانستی لەبارەی ناوی ڕاستی یانەوە بدرێت.

ئێستا لەکوردستانا دوو ئیستیلاحی کرمانجیو سۆرانیو تەنانەت زۆرجار سۆرانیو بادینانی بەرامبەر بەیەکتر بەکارهێنان بەمەبەسی کرمانجیی ژووروو کرمانجیی خواروو زۆر باوە.. هەرچەندە دابەشکردنەکانی پێشوو پێداچوونەوەیەکیان دەوێت. باری ئەم ۳۰-٤۰ ساڵەی دوایی کوردستان بە تایبەتی باشوورو ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەندێك شتی لەم رووەوە گۆڕیوە.

ئێمە لەکاتێکدا کەلێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیی دیالێکتەانی کوردیو بەشەکانیان و بەشەکانی ئەوانمان ئەوێت، دەبێ ئەو لێکۆڵینەوانە کەسانیپسپۆر بیانکەن، یا بریێنە بەردەست ئەو کەسەپسپۆرانەی لەلایەنە مێژوویيو تیۆرییەکانی ئەم مەسەلەیە دەگەنو لەبەر ڕووناکیی کەرەسەکەو بنەڕەتە زانستيو تیۆرییەکاندا دەگەنە ئەنجامێکی نوێ

زانایانی کوردو کوردولۆگەکان تائێستا هەرچەند هەوڵی باشیان لەم بارەیەوە داوە. هەندێکیان بەلێکۆڵینەوەی تاقە دیالێکتێك یا بەشێکی و هەندێکیان بەگشتی. هەرچی ئەوانەی بەبیری خۆیان زمانی کوردیان دابەش کردووە.

تۆفیق وەهبی زمانی کوردی بەسەر چوار شێوەدا دابەشدەکات (کرمانجیی، کۆمەڵە شێوەی لوڕی، شێوەی گۆرانی، شێوەی زازایی) کەدێتەسەر باسی شێوەی کرمانجیی لەسەرەتاوە سنووری ناوچەی شێوەیکرمانجی بەم چەشنە دەستنیشان دەکات.

(سنوری شیمالیی شێوەی کرمانجی تەقریبەن خەتی ئەریوان- قارس – ئەرزرۆم- ئەرزنجان- مەلاتیيە- مەرعش- ئەسکەندەروونەو سنووری جنوبیشی خەتی کرماشان – خانەقی – قەشقە- دیجلەیە

هەرچی بەشەکانی شێوەی کرمانجی‌یە ، بەلای ئەوەوە بەم جۆرەن:

١. شێوەی کرمانجیی شیمالی

٢. شێوەی کرمانجیی جنووبی

سنووری مەیانی ئەم دوو شێوەیە بەنزیکە خەتێکە لە جنوب، نیوەڕۆی گوڵی ورمێوە بەرەو رۆژئاوا ئەروا هەتا ئەگاتە زێی بادینان کەلەوێوە بەزێی بادیناندا ئەڕوا هەتا ئەگاتە دیجلە)

بێچووەکانی شێوەی کرمانجیی شیمالی لای تۆفیق وەهبی ئەمانەن:

١. شێوەی بایەزیدی . ٢. شێوەی هەکاری . ٣. شێوەی بۆتانی. ٤. شێوەی ئاشتیەیی. ٥. شێوەی بادینانی).

بنچینەی شێوەی کرمانجیی شیمالی بەلای تۆفیق وەهبی‌یەوە ئەشێ شێوەکانی کورتی —کەردوو-مادی ئاتەرباتەکان بێ.. هەروەك بێچووەکانی شێوەی کرمانجیی جنووبی لای ئەو ئەمانەن:

١. شێوەی موکری. ٢.شێوەی سۆرانی. ٣. شێوەی سنەیی ٤. شێوەی سلێمانی.

لای وایە ئەم چوارە شێوەیە بەپێی ئەو سروشتی‌یە موشتەرەکە کەلەناو خۆیانا هەیانە بوون بەدوو دەستە:

١. شێوەی موکری — سۆرانی

٢. شێوەی سنە- سلێمانی

دەشنووسێ (ئەوەی ئەم دوو دەستەیە لێك جوێئەکاتەوە بوونی هەندێ سروشتیی (خواصی) شێوەی کرمانجیی باکووری (شمیالی)یە لەشێوەی موکری — سۆرانیدا. تاوی کرمانجیی شیمالی لەسەر سۆرانی زۆر موهیمە.

بنچینەی شێوەی موکری – سۆرانی ئەشێ شێوەی کورتیی مادی ئاتەرپاتەکان بێ. بنچینەی شێوەی سنە – سلێمانی شێوەی کورتی سادەی گەورمیە هەروەك تۆفیق وەهبی دیالێکتی گۆرانی لەشوێنێکی تردا دەکات بەم بەشانەوە:

هەورامی، زەنگەنە، کاکەیی ، باجەلانی

هەرچی د. ن. مەگنزییە ئەوە دیالێکتەکانی کوردی بەم چەشنە دابەش دەکات

بەڵام وەك دەردەکەوێت ئەم دابەشکردنە لایەنی جوگرافیەی زیاتر گرتۆتەوە نەك لایەنی نزیکیی زمان.

کۆمەڵە شێوەی لوڕی لای تۆفیق وەهبی ئەمانەن:

١. کەلهوری ٢. لەکی. ٣. فەیلی. ٤. لوڕی ٥. بەختیاری . ٦. مامەسانی کۆه گەلۆریی

سنووری باکووریی کۆمەڵە شێوەی لوڕی لای ئەو- سوڵتان ئاباد ، دەوڵەت ئاباد- کرماشان- خانەقی، و سنووری نیوەرۆییەکەی نزیکەی شیمالی شیراز – کازرونە

کۆمەڵە شێوەی لوڕی کەلەپێشا کرمانجی بووە. بنچینەکەی ئەشێ کورتیی مادی گەورە بووبێ، تاوی دوایی فارسیی لەسەرەو لەگەڵ سۆرانیشدا پێوەندیی هەیە.. لەکی، کەلهوڕی، فەیلی بە کرمانجی جنووبی نزیکترن. لوڕیی ئەسڵیو بەختیاری لەگەڵ مامەسانی- کۆه گەلۆییدا زۆرتر کەوتوونەتە ژێر تاوی فارسییەوە کەدراوسێن.

شێوەی گۆرانی، لەخەتی کرماشان بەرەو غەرب لەهەندێ دێهاتی لەحدوود زۆر بەدووری عیراقو ئێراندا قسەی پێ ئەکرێ لەعیراقدا شێوەی هەورامی، زەنگەنە، کاکەیی، گۆرانییە (دەتوانین باجەلانی و رۆژبەیانیش لێرەدا بژمێرین – ع. م)

گۆرانی لەناو شێوەکانی کوردییا لەهەموویان زیاتر سروشتی ئاوێستایی پێوە ئەبینرێ، بنچینەکەی ئەشێ شێوەکانی گۆرانیو کورتیی مادی گەورەبێ. تاوی دوایی لوڕیی لەسەرە.

## لەبارەی شێوەی زازاوە دەنووسیٚ:

لەناو مەنتیقەی شێوەی کرمانجیی باکوریدا لەهەندیٚ پارچەیو لایەنەکانی ئەرزرووم، خەربووت، بتلیسو دیاربەکردا قسەی پیٚ ئەکریٚ، بنچینەکەی ئەشیٚ لەگەڵ هی گۆرانیدا یەك بیٚ، تاوی دوایی کرمانجیی شیمالیی لەسەرە.

تۆفیق وەهبی چەند دێر بۆ باسی (شێوە وردەکانو سەبەبی یەکلایی نەبوونەوەی هەموو شێوەکان) تەرخاندەکاتو دەنووسیٚ:

(لەهەموو جیٚیەکی کوردستانا نادر نیٚیە کەپیاو تووشی هەندیٚ شێوەی ورد وردی محەلی بیٚ، ئەمانە ئەشیٚ لەرووی جێگیربوونی عەشیرەتێکی کۆچەری، یان جیٚگۆرینی یا چ عەشیرەتێکی بچووك، یان لەبەرتێکەڵاوی یان هاوسنووریو توجارەت لەگەڵ نەتەوەیەکی بێگانەدا پەیابووبن، ئەم ئەسبابە لەسەر تەتەوری هەموو شێوەکان تەئسیریان بووە. دروستبوونی شێوەکانی لوڕ وێنەیەکن بۆ ئەمە.

زۆریی مەوانیعو حەواجیزی تەبیعیی وەکو شاخ، ڕووبارو دژواریی (مشکلاتی) لەحەد بەدەری هاتوچۆی ناوخۆ بوونەتە سەبەبی دروستبوونی گەڵیٚ مەناتیقی جویٚ جویٚ کەبێگومان لەسەر دروستبوونو پارێزەرانی شێوەکان تاوی گەورەیان بوە. زمانی کرمانجی لەگەڵ ئەم وەزعی جوگرافیو موقەدەراتی تەئریخیەو سیاسیەداو لەگەڵ نەبوونی نەشریاتو موعامەلاتی تەحریریە پێی دیسانەوە پارێزرانی لەم دەرەجەیەی ئێستادا شایانی حیرەتو ستایشە).

هەرچی ئەم (سۆرانی)یەیە کەلەبەرنامەی ئەم سیمینارەدا بۆئەوە دانراوە کەباسی ئێستاو ئاسۆی بەرەوپێشچوونو گۆڕرانی بکەم، ئەوە هەر بەبەرنامەکەدا دیارە کەمەبەس لەوە هەموو کرمانجیی خوارووە، کەلام واباشترە بەکوردیی خوارووی ناوبەرین.

هیچ دیالێکتێکی کوردی هێندەی ئەم دیالێکتە یاردەی تێکەڵ بوونو کارکردنە سەریەکی بەشەکانیو کارکردنە سەر یەکی زمانی قسەکردنو زمانی ئەدەبیاتی پێوە دیار نیٚیە. هەر وەك ئەوەی بۆ ئەم دیالێکتە ڕەخساوە لەڕووی بەردەوامیی

پێنووسین‌و بوون بەزمانی ڕەسمیی خوێندن‌و کاروباری دەوڵەت ئەوە زروف داگیرکردنی کوردستان وایکرد کەبۆ دیالێکتەکانیتر نەڕەخسێ.

پێش دروستکردنی شاری سلێمانی لەلایەن کوردەوە چەند بەڵگەمان لەناوچەی سلێمانی‌و موکریان هەیە کەبابەتی فۆلکلۆرو بابەتی شیعری میللیی دەمیی وەك بەیتەکانی عەلیی بەردەشانی (سەدەی ١٨و ١٩) بەم دیالێکتە هەبووەو بەپێی ناوچەکەی (بەری مەرگە) و بەپێی گێڕانەوەی ڕوخساری هەموو بەشەکانی دیالێکتەکەی پێوە دیارە.

لەدروستبوونی سلێمانیەوە ١٧٨٤ پەرەسەندنی ئەدەبیات‌و پەیدابوونی قوتابخانەیەکی پتەوی شیعری کوردی (سالم- نالی- کوردی) دەبینین کەلەرووی مێژووی شیعرەوە بەردەوامیی قوتابخانەی شیعریی (مەلای جزیری‌و ئەحمەدی خانی) بوو. ئەم قوتابخانە شیعری‌یە لەرووی زمانەوە بناغەکەی بەشە دیالێکتی سلێمانی بوو. بەڵام هەر بەبڵاوبوونەوەی کاری شاعیرانی ناوچەکانیتر بەزمانەکەیەوە دیارە، هەروەك لەڕیڕەوی ئەدەبیدا کزی‌و وەستانی بەخۆیەوە نەدی. (حاجی قادری کۆیی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، مەحوی، مصباح الدیوان، سیف القضاة، تادەگاتە شیعری نوێ‌و ڕابەرانی (گۆران، شێخ نوری، پیرەمێرد)(١)

لەسەرەتای دروستبونی سلێمانیدا یەکەم کتێبی خوێندن بەکوردی پەیدادەبێت، کە(ئەحمەدی)ی شێخ مارفی نۆدێیەو بەردەوامیی (نۆباری بچووکان)ی ئەحمەدی خانی‌یە (فەرهەنگی عەرەبی – کوردی) یە بەشیعر. هەر لەشیعری حاجی قادرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەدەرسی زانست (زمان‌و شەریعەت‌و مەنتیق ..هتد لەمزگەوتەکانی سلێمانیدا لەو سەردەمەوە پاش ڕوخاندنی بابانیش بەکوردی بووە (باکتێبیش بەکوردی نەبووبێ)

لەبەرئەوەی سلێمانی تازەبوو. خەڵکەکەی لەشوێنی جیاوازی کوردستانەوە هاتبوون‌و تێکەڵ بەخەڵکە کۆنەکەی خۆی (گوندی مەڵکەندی‌و شاری قەلاچوالان) بوون، هەم ڕەگەزی جیا تێکەڵ بەیەك‌و بەزمانی قسەکردن بوو، هەم دەستکەوتەکانی زمانە ئەدەبی‌یەکە دەچووە ناو زمانی قسەکردنەوەو هی زمانی قسەکردنیش پاشان بەتەوژم دەهاتە زمانە ئەدەبی‌یەکەوە (گۆران و پیرەمێردو پاش ئەوان)

زمانی کوردی لەسەردەمی حوکمڕانیو مەلیکێتی شێخ مەحموددا (١٩١٩-١٩٢٥) بوو بەزمانی خوێندنو کاروباری رەسمیو بۆ یەکەمجار رۆژنامەی کوردی هاتەوە سەرخاکی کوردستانو چاپخانە لەکوردستاندا بینرا..

ئەم رێڕەوە لە بەزۆر ئیلحاق کردنی کوردستان بەعێراقیشدا کەمو زۆر بەردەوام بووو ناوچەکەی لەپەرەسەندنو کشانەوە (مدو جزر) دابوو.

هەر لەدەسەلاتی کۆمەڵەی (ژ.ك) ەوە تا ساڵی جەمهوریەتی کوردستان ئەم تەجروبەیە لەو مەڵبەندەش دووبارە بۆوەو تەئسیری تائێستا دیارو بەردەوامە.

سلێمانی سەردەمێك بوو بەمەرکەزی ئەدەبو کلتوور، کاری تەواوی ئەو مەرکەزە بەسەر خوارووی کوردستانەوە، بەسەر بەشەکانی دیالێکتەکەوە دیارە. ساڵانی ١٩٥٨-١٩٦١، ١٩٧٠-١٩٧٤ لوتکەی ئەم کارتێکردنەو سەرەتای تێکەڵبوونێکی تازەن.

پرۆسەیەکی ئاسایی و عەفەوی لەگەڵ هەندێك نەخشەداناندا تێکەڵ بەیەکبوون. فراوانبوونەوەی گۆڕەپانی بەرهەمی ئەدەبی وردە وردە دیاردەی نزیکبوونەوەی بەشەکانی کوردیی خواروو دەهێنێتە مەیدانی ژیانو بەرەوپێشچوونی هەموو زمانی کوردیو کارکردنە سەریەکیی دیالێکتەکان بەجۆرێك کەپێش دروستبوونی دەوڵەتی یەکگرتووی کوردستان سیمای زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوو دیار بێت.

جیاوازیی بەشەکانی کوردیی خواروو وەك هەموو هاو وێنەکانی خۆیان لەمەیدانی زماندا لەرووی فۆنەتیکیو مارفۆلۆگیو فەرهەنگی زمانەوەیە، بەلاّم وردە وردە تێکەڵیو پێوەندیو نزیکبوونەوەی باری ئابووریو رێگەو بانو هەموو هۆیەکانی راگەیاندن (کتێبو رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆن) ئەو جیاوازیيانە کەم دەکەنەوە. بەجۆرێك کەدەتوانین بڵێین ئێستا لەناو هەلگرانی ئەم بەشە دیالێکتانەدا تەنگوچەڵەمە (پرۆبلێم) ی لەیەکتر نەگەیشتن نەماوە.

تۆفیق وەهبی لەسەرەتای دەستدانەکاری زانستیی خۆیدا لای وابوو کەبەشە دیالێکتی سلێمانی وەك خۆی دەبێت بەزمانی ستانداردی کوردی. بەلاّم واقیعی ژیانو رووداوی مێژوویی کوردستان ئەوو ئەوانەشی وا لێکرد کەئەم باوەڕە بگۆڕن و لەئێستاوە سیمای تێکەڵیی زمانی ستاندارتی کوردی ببینن. ئەوەتا لەم ساڵانی دواییەدا

زۆر شتی دوور لەسلێمانی بەکاردەهێنێت، بۆ نموونە: راناوی (ئەز)ی لەژوورووەدا باوو راناوەکانی سەر بەو رشتەیە لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕدا.

ئەگەر بەکورتی چەند نموونە بۆ ئەم دیاردەیە بهێنینەوە دەڵێین:

ئێستا لەناو شاری (گۆڕاووتێکەڵی سلێمانیدا) کەم کەس دەبیستیت (دال)ی کلۆر وەك جاران بەکاربهێنێت:

لەجیاتی (مندال) یا هەر مندال دەبیستیت یا بووە بەمنال- هەر بەو جۆرەش : خوێندن – یا خوێننە یا خوێندنە، یا ماندوو، ماندوو ، مانوو .. هتد. تەنانەت (ناوی عەلەم)ی شاری بەغدا کارێکی سەیری لێ بەسەرهاتوە. لەسەرەتادا لەناو کورددا (دال)ی دووەمی نەما بوو بەبەغدا، لەسلێمانی دەوترا (بەغدا) تا بوو بە(بەغا) ئێستا لەناوچەی سۆراندا تەنانەت لەنووسینیشدا خەریکە (بەغا) پەرە دەسێنێت.

هەر بەم جۆرە دوو دەنگی (نگ) کەلەسلێمانیدا یەکیاندەگرت دەبووە : مانگ – مان یا ڕەنگ ئێستا زۆرتر بۆتەوە بەڕەنگ، یا مانگ یا مان یا ڕەن.

لەزۆر گەڕەکی جارانی سلێمانیدا، هاتەوانێ، ڕۆیشتەوانێ، بەگوێرەی زمانەوانییەوانی- کەوابزانم لە(بانە)وە هاتبووە شاری نوێی سلێمانی بەکاردەهات- ئێستا بەدەگمەن ئەم بەکارهێنانە دەبیستیتو لەقسەدا بەزۆریو لەنووسیندا بەتەواوی هاتەوە، ڕۆیشتەوە، بەگوێرەی زمانەوانییەوە دەبینین.

بەکارهێنانی (لامی قەڵەو) (ڵ)ی سلێمانی ئێستا بەزۆری لەناوچەی سۆرانداباوە – تەنانەت زۆر جار بەنەزانیو باش وەرنەگرتنەوە جیاوازی لەبەکارهێناندا دەبیو دەبێتە هۆی هەڵەی باو. گەل، گەڵ – گول – گوڵ

سالانێکی زۆر دیارترین ڕۆشنبیری موکریان لەعیراقدا ژیان – هەژار، هێمن، عەبدولرەحمان زەبیحی، عەبدوللای حەسەن زادە، کەریمی حسامی.. هتد. لەنووسینی ئەماندا کارکردنی ناوچەی سلێمانی – سۆران دیارەو شوێن پەنجەشیان بەسەر نووسەرانی ئێرەوە بەجێهێشت. لەپاڵ دەیان وشەی موکریانیی ئێستا ئاساییو باو لەنووسینی (سلێمانی – سۆران)دا بەکارهێنانی پاشبەندی وەك (دیکە) لەجێی (تر)و دیاردەی تر دەبینین: ڕۆژێکی تر، ڕۆژێکی دیکە.

نەخشەیکتێبو بەڕێوەبەریی گشتیی خوێندنی کوردیو تەنانەت کۆڕی زانیاری کوردیو کۆبوونەوەو کۆڕە ئەدەبییەکانی یەکێتی نووسەرانی کورد لەساڵی ١٩٧٠وە تێکەڵ بەم پرۆسەیە بووە. بۆنموونە، لەزۆر شوێنی کوردستاندا دوو تیپی (تن) دەچنە سەر فرمانی رابوردوو – دەڕواتن، دەکاتن، دەخواتن، لەسلێمانیدا ئەمەبووە بەئەڕوا، ئەکا، ئەخوا. پاش بریار لەهەموو ئەو کتێبانەدا چەشنی ناوەڕاست هەڵبژێررا: دەڕوات، دەکات، دەخوات. ئێستا خەریکە ئەم بەکارهێنانە لەقسەی نەوەی نوێدا دەبێت بەباو.

هەرچی جیاوازیی گەورەی نێوان سلێمانیو هەموو دیالێکتو بەشەکانی تری کوردییە- ئەویش بەکارهێنانی (ئە)یە لەجیاتی (دە) لەپێش فرمانی داهاتوودا. ئەڕۆم، ئەنووسم، ئەنووم، ئەوەش بەبریار بۆ وە بە(دەڕۆم، دەنووسم، دەخەوم یادەنووم) و خەریکە لەسلێمانیدا دەبێ بەباو.

لەساڵانی پاش ١٩٧١ دا لەکتێبی قوتابخانەدا دەسکارییەکمان دەکرد بەتایبەتی (هەژارو شکور مستەفاو خاوەنی ئەم وتارە) کەناونرا (krmanjikation- کرمانجیەکەیشن) بەبەکارهێنانی زۆر وشەی هاوبەشو ئەوسا (ژووورووش) و هەندێ لایەنی فۆنەتیکیو مارفۆلۆگیی ژووروو. ئەمە وردە وردە لەنووسینی نووسەرانو لەقسەکردنی نەوەی نوێدا رەنگی دایەوە. دەیان وشەی نەزانراو کەوتنە سەرزمانو بوون بەباو- رەنگە بەکارهێنانی دوو جۆرە راناوی (ژووروو) یا ئەو جۆرە رەفتارەی لەوێدا لەگەڵ نێرو مێ دەکرێ (لەحاڵەتی ئیزافەی تاك)دا (کچا من – کوڕێ تە) نەبووبێ بەباو. بەلام ئێستا دوو چەشنە رەفتار لەگەڵ فرمانی (مبنی للمجهول) دا دیارو باوە : کوژرا، هاتە کوشتن، نووسرا، هاتە نووسین.

بلاوبوونەوەی بەکوردی خوێندن (بەرەسمی لەعیراقدا) و بەکوردی نووسینو خوێندنەوە (بەکۆششی مەردانەی نووسەران لەئێران)، بەکارهاتنی دەسکەوتە تازەکانی تەکنیك، رادیۆو تەلەفزیۆن (کەدیارە کورد تا ئێستاش رادیۆی نهێنیی لەئاشکرا زیاترە) گەلێك وشەی دیالێکتو بەشە جیاکانی کرد بە(کوردیی گشتی)و لای کورد بەکارهێنراو. لەم مەیدانەشدا دەوترێت کەزۆربەی ئیستیلاحە زانستیو تەکنیکییەکانی ئەم سەردەمە بەجۆرە (لاتینی)یەکەی کەوتنە سەر زارو نووسینی هەموو کوردەوە، لەم بوارەدا دەبێ لەبیرمان نەچێت کەسی ساڵ شۆڕشی چەکداری

باشوورو ئەم ساڵانەی ڕۆژهەڵاتو باكوور دەیان وشەی هاوبەشی هەموو ڕۆژێ بەكارهاتووی پەیداكردووەو بڵاویكردۆتەوە. بۆنموونە: پێشمەرگە، هێز، سەرلق، سەرپەل، كەرت، ئازۆخە، تەقەمەنی.. هتد، هەروەك یەكگرتوویی بزووتنەوە تێكەڵیی پێشمەرگەش هاوبەشی لەزماندا دروستكرد.

ئەنجامی ئێستای باشووری كوردستان، بەتایبەتی پاش ڕاپەرینی بەهاری ١٩٩١و هاوینی ١٩٩١و بەتەواوی دەركردنو كشانەوەی داگیركەرو هەڵبژاردنی پەرلەمانی كوردستانو دانانی حكومەتی كوردستانو كاری خوێندنو ڕۆشنبیری لەهەموو پلەیەكدا و كاری ڕاگەیاندنی هەمە ڕەنگو هەمەلایەن كەوتنە دەست كورد خۆیو نوێنەرانی، بەتەواوی پرۆسێسی یەكگرتنی دوو بەشە دیالێكتی (سلێمانی - سۆرانی) لەكاردایەو لەگەڵ بادینانیو بەشەكانی تری (كوردیی ژووروودا) بێ پێوەندی نییە، ئەمە بێجگە لەپێوەندیی تەواوی (موكریان — سنە) لەگەڵ ئەم پرۆسێسەدا.

تۆفیق وەهبی زوو دەستنیشانی كردبوو كەباڵی (سۆران — موكریان)ی كوردیی خواروو زۆر دیمەنی كوردیی ژوورووشی تێدایە. كەواتە چ لەژێر تەئسیری باری ئێستای هەموو كوردستانداو چ ئەو دیمەنانەش بەكورتی — باری سیاسی ئێستای كوردستان كارێكی گەورە دەكاتە سەر زمانو ئەو كارەش بەرەو تەواو نزیكبوونەوە یا یەكگرتنی (بەشە دیالێكتەكانی خواروو)و نزیكبوونەوە لەژوورووویان دەبات. هەرچی كوردی گۆران (هەورامی، زەنگەنە، باجەلانی، ڕۆژبەیانی، كاكەیی.. هتد) ئەو نزیكبوونەوەیان لەم پرۆسێسەوە زۆر دیارە، بەتایبەتی كەزمانی نووسین لای نوێنەرانو قوتابیانیان هەر ئەوەیە كەلەناو (كوردیی خواروو)دا بەكاردێت.

كورد دەڵێ: (زاڵم ئاوی سەرەوژوور دەڕوات) بەم پێیە پانزدە ساڵ كۆكردنەوەی كوردی (بادینانو شنگارو سۆرانو سلێمانیو شارەزوورو گەرمیانو هەورامان) پاش وێرانكردنی دێهاتیان لەئۆردوگای ئیجباری گەورەدا چ لەپانایییەكانی باكووری كوردستان خۆیداو چ لەناوچە عەرەب نشینەكانی عیراقدا- یان پەنابەریی حكومەتە دراوسێیەكانی عیراقدا، كارێكی گەورەی كردە سەر ئەم نزیكبوونەوەیەی زمانی كوردی. ئێستا زۆربەی دێهاتییەكانی باشوور چوونەوە جێی خۆیان- بەڵام دەیان دیمەنی فۆنەتیكیو مارفۆلۆگیی شێوە یا بەشەكانیترو سەدان ووشەیان لەگەڵ خۆیان بردەوەو

زۆری خۆیشیان لەدێهاتی دەوروبەری ئۆردوگاکە بەجێ هێشت بەتایبەتی ئەو نەوەیەی ئەوپانزدە ساڵەی لەمنداڵی‌یەوە دەستیپێکرد.رێگەم بدەن – دواوتەم شاعیرانە بێت. کەعەبدوللا گۆرانی شاعیری مەزن هاواری کرد (ئاسۆی هیوای کورد مژدە بێت لەتۆ) ئەوا ئێستا ئەو ئاسۆی هیوای کوردە راستەقینەیە، ئاسۆی ژیان‌و دوارۆژی سیاسیەتی‌و بەراستی (ئاسۆی پەیدابوونی زمانی ستانداردی نووسینی کوردی) یەکە لەزمانی قسەکردنەوە نزیکەو هەرچی‌یەك بێت‌و هەر دیمەن‌و رەگەزێکی تێدا دیارترو گەورەتر بێت، هەر کوردی‌یەو بۆهەموو کورد دەبێت و لەدەوڵەتی یەکگرتووی کورددا دەبێت•

# زمانەوانی باوکی فلان

ئەمە چەند ساڵێکە، ئەم کوردو ئەو کورد ئەبینم، کە بەباوکی فلان، یا باوکی فیسار یەکتر بانگ ئەکەن، بەڵکو تەنانەت هەندێ نووسەریشمان لەو نووسەرانەش کەکوردی ئەنووسن، جاروبار گەر بیانەوێ نووسینەکەیان نەناسرێتەوە، لەجیاتی ناوێکیتر ئیتر هەر لەسەر پێڕەوی عەرەبی خواستەمەنی یان نهێنی لەجیاتی ئەو ناوە، دێن بەناوی (باوکی فلان، یا فیسار)ەوە ئەنووسن.

ئەوەی زانراوە ئەوەیە کە لەناوە ڕێکوپەوان و راستەقینەکەی هەموو کەسێکدا پێی ئەوترێ (کنیە)، ئەویش ئەوەیە کە لەپاڵ ناوەکەی خۆیدا بە (ابو فلان) ناوبرێ، هەبوو کۆن پێڕەوێکی تایبەتی لە (کنیە) هەڵبژاردنا هەبوو، ئێستا وای لێهاتووە کەعەرەب هەموو کەسێك بەناوی کوڕیشیانەوە بانگ ئەکەن و ژنیش بەناوی دایکی فلانەوە بانگ ئەکرێ.

بەڵام لەناو کورددا، ئەوە زانراوە هەر ئەوەیە کە لەهەندێ ناوچەدا ژن و مێرد، یا لەبەر ئەوەی کەشەرم ئەکەن ناوی یەك ببەن، یا لەبەر خۆشەویستی منداڵەکەیان، بەباوکی فلان و دایکی فلان یەکتر بانگ ئەکەن، یا ناوی یەکتر ئەبەن، بەڵام من و تۆ بەباوکی فلان یەکتری بانگ بکەین، ئەوە نەبیستراوە نەلەکۆن و نەلەتازەدا.

نەبێکەسیش بەناوی (باوکی شێرکۆ)وەو نە (گۆران)یش بەناوی (باوکی هۆگر)ەوە شتیان نەنووسیوە، زۆرجار بەناویترەوە شتیان نووسیوە، بەڵام هیچ کاتێك نەیان کردووە بەناو بۆ خۆیان.ڕەنگە کوردیش وەك زۆر نەتەوەیتر، کەلچەری عەرەب کاری کردبێتە سەر هەندێ دیمەنی کەلچەری نەتەوەیی، بەڵام گەر بەهەزارو ئەوەندە ساڵ کونیەی عەرەبی نەهاتبێتە زمانەکەمانەوە، ئەوا ئێستا بەکارهێنانەکەی دیمەنێکی لەکوردیەوە دوور ئەدات بەو

نووسەرەی لەو کونیەیە بگەڕێ بۆ خۆیو لەبانگ کردنیشیا کەیەکێك بەباوکی فلان بانگ ئەکەین، هەر لەوە ئەچێ کەلاسایی ژنان بکەیتەوە.

## زانای ئاینی

زۆر دەمێکە بەلای کەمەوە پێنج، شەش سەدە ئەبێت کە لەکوردستانا وشەی (مەلا) بەمانای زاناو خوێندەواری تەواو دائەنرێ، تەنانەت لەناو خەڵکە سادەکەشدا کەبەئیستیلاحی جاران عەوام مان پێ ئەوتن، کەباس لەزانایەتی کەسێك بکرایە ئەوترا مەلای (دوانزە عیلم)ە.

لێرەدا مەبەست لەوە نییە کەئەم وشەیە چۆن لەکوردیدا پەیدابووەو چۆن بۆ ئەو مانایە بەکارهێنراوە، هەرچەندە باسێکیش لەوە ئەکەین.

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کەمەلا چ لەقسەداو چ لەنووسیندا بۆ زانا بەکارئەهێنرا تاپاش دەوری عوسمانیش، بەڵکو تائێستاش بەناوی فرمان، یا وەزیفەش ئەزانرێ، واتە، کەوتت فلان کەس بوو بەمەلای فلان شوێن، یا فلان مزگەوت، ئەوە وائەگەیەنێ، کەبووە بە (مودەڕیسو ئیمامی ئەو مزگەوتەو بەخەتیبیشیو گەر نوێژی جومعەی تیا بکرێ)، بەلام پاش دەوری عوسمانی، کەناچار بوین، بەرامبەر بەئیستیلاحەکانی لای خۆمان عەرەبی بدۆزینەوە، ئەوا وشەی (مەلای) کوردیمان کرد بە (عالم دینی)ی عەرەبی.

لەناو عەرەبدا، بەتایبەتی لەعیراقا وشەی مەلا هەیە، بەلام بەو مانایەی ئێمە نییە.

تا ئێرە هەڵە لەقسەدا دیار نییە، بەلام سەیر ئەوەیە، کەهەندێ لەتازە نووسەرەکان کەدێن باسی ژیانی زانایەکی کورد ئەکەن، لەجیاتی ئەوەی بنووسن، لەو ساڵەدا بووە بەمەلا، یا کەئیجازەی وەرگرت بوو بەمەلای ئەو مزگەوتە یا ئەو گوندە، لەباتی ئەمە دوو وشەی (عالم دینی)یەکەی عەرەبی، کەخۆی وەرگێڕانی کوردییە، ئەکەنەوە بەکوردیو ئەنووسن (بوو بەزانای ئایینی) یا بە (مامۆستای ئاینی)ی فلان مزگەوت.

گەر ئەمە لەنووسینی ئەو تازە نووسەرانەدا بوایە کەهەر مزگەوتیان نەدیوە باش بوو، بەلام سەیر ئەوەیە کەهەندێ لەمەلاکانیشمان خەریکن ئەو ڕێگەیە ئەگرن، کەبەڕاستی نووسینی کوردی ناقولا ئەکات.

گەر هەموو ئیستیلاحێکی ناو کورد، کە لەعەرەبیدا نەبێ، بەدوو وشە بکەین بەعەرەبیو جارێکیتر بیانکەینەوە بەکوردی، ئەبێ زمانەکەمان چی بەسەر بێت؟

بۆ وشەی (مەلا)ش کە لەچییەوە هاتووە؟ قسەیەکی بلاو لەناو مەلایانی کوردەواریا هەیە کەگوایە لە (امتلاو) واتە (پڕ)ی عەرەبییەوە هاتووە، یا لە (من لا)ی عەرەبییەوە هاتووە، کەگوایە (من لاجهل له) ئەمە هەر قسەیە، بەلام ئەوەی بەنووسین لەم باسە دوابێ هەر مامۆستا عەلائەدین سەجادییە کەلای وایە، وشەی مەلا لەپاش پەلامارەکەی جەنگیزخانەوە (١٢١٧)ز، لەولاتەکانی ئیسلامدا، لەغەیری عەرەبستانا-بلاوبووە، چونکە مەغولییەکان بەسەرۆکە ئاینییەکانی خۆیان ئەوت (لاما)، ئەم وشەیە دەستکاری کرابوو بە (مەلا)(١).

ئەوەی نەختێ ئەبێ بەبەلگە بۆ ئەم رایە مامۆستا سەجادی، کە لەکتێبەکەیدا ئەوە دیار نییە، کەڕای خۆیەتی، یا لەوەوپێش وتراوە، ئەوەیە کەسەدرەدین عەینی نووسەری گەورەی تاجیك-لەباسی ژیانی خۆیدا ئەوە ئەگێڕێتەوە کە لەسەدەی رابردوودا لەسەمەرقەندو بوخارا، مامۆستا گەورەکان، یا بلێین مەلا گەورەکان بە (داملا) ناوئەبران‌و ئەمە لەقەبی شەرەف بوو بۆیان(٢)، بەلام ئەوەی لەو رایەمان دورو ئەخاتەوە ئەوەیە کەئەحمەدی خانی لەچەند شوێنێکی مەم‌و زیندا ناوی (مەلا)یان ئەهێنێ‌و وشەی مەلا بە (موالی)ی عەرەبی کۆئەکاتەوە، کەواتە ئەبێ (مەلا) (موالی)ی عەرەبی بێ کەبەمانای گەورە یان (سەید)ە:

ئەڤ رەنگە بەبیژەوان حەبیبان

مەجموعی مەوالی‌و خەتیبان

هەنەك ژ مەرا ببن رەجاچی

هەندەك ژ وەرا ببن دوعاچی(٣)

ئەوەش دیارە کە تائێستاش لەو ناوچانەدا کە بەکرمانجی ژووروو ئەدوێن بەرامبەر بە (مەلا) یا مامۆستا وشەی سەیداش بەکاردێت.

بەڵکو خانی، کە لەچەند شوێندا وشەی (مەلا) بەکار ئەهێنێ، لەهەندێ شوێندا (مەولا) ئەنووسێ:

عیقداستی مەکر ل تاژدین

ئیجابە، ئەڤە، قوبولە، ئامین

هەرچی کو وەکیلە بیتو روونێت

مەولاکیە خوتبەیی بخوونیت(٤)

* * *

ئەمانەش چەند وردە باسێکی زمانو کەڵچەری نەتەوەییمانن، کە بۆ خوێندنەوەی سەرپێی دەست بدەن.

(١) راستکردنەوە:

وەك وتمان، پاش ئەوەی خوێندنی عەرەبی لەکوردستانا بوو بەباو، منداڵ لەپۆلی یەکەمی سەرەتاییەوە گوێی بەوشەو رستەی بیرو زانست بەعەرەبی دارشتن رادێت، لەو ساوە زۆر لەنووسەرانی لاومان کوردی نووسینەکەیان لەقاڵبێکی عەرەبیدا دائەرێژن، هەندێ ئیستیلاح ئەهێننە زمانەکەمانەوە، کە بەکارهێنانیان لەپێرەوی پێوەندی نێوان زمانەکەمانو کارکردنەکەیان ئەچێتە دەرەوە.

رەنگە هەندێ کەس بپرسنو بڵێن عەرەبی خوێندن لەناو کورددا هەر لەو کاتەوە دەستی پێکردووە، کەمزگەوت بوو بەشوێنی نوێژیشو خوێندنیش.

کەواتە بۆچ ئەم جۆرە کوردی لەقاڵبی عەرەبیدا دارشتنە لەشیعری خانیو مەولەویو مەحویو بێخوددا نەبوو، کەهەمووشیان لەمزگەوتدا خوێندویانە؟

دیاره ئەوەی شارەزای بڵاوبوونەوەی خوێندنو جۆری خوێندنی مزگەوت بێت، ئەوە ئەزانێ کەفوتابی پێش ئەوەی لەمزگەوتا بخوێنێ، لەفوتابخانە کەحوجرەی مەلاشی پێ ئەوترا، هەر پاش فورئانو خوێندنەوە فێربوون، ئەسەرە بەرزەکانی ئەدەبی فارسی خوێندووەو لەگەڵ سەعدیو عەتارو ئەدیبانی تردا ئاشنایی پەیداکردووە، فارسیشی لەبەر ئەوەی ئەچێتەوە سەر گروپی ئێرانیی زمانەکانی هیندۆ ئەوروپی، لەبەرئەوە گەر کاریشی کردبێتە سەر شێوەی نووسینی شیعرەکانمان، قاڵبەکەی کوردی نەشێواندووە، بەڵام زمانی عەرەبی کەزمانێکی سامیە، زۆر لەکوردی دوورە، بۆیە قاڵبی زمانەکەمان ئەشێوێنێ.

پیرەمێرد ئەڵێ (ئەمەوێ بڵێم ئەم کوردەوارییەی سلێمانیو چواردەوری لەباوو باپیرمانەوە لەئەدەبیاتدا تەنها پێڕەوی فۆرسمان کردووەو خوێندنو نووسینو شیعر خوێندنەوەو وتنمان هەر بەفارسی بووە، هەرچەندە بەهۆی ئەمەوە کە لەژێر ئیدارەی تورکدا بووینو ناچاربووین زمانی تورکی بزانین لەگەڵ ئەوەشدا هەر بەیەك نەزم هەڵپەڕیوین) (١) ئەمەش هەر سەرەتایە. بابێینە سەر مەبەسو چەند نموونەیەك:

★ ★ ★

### (٢) پێی هەستا:

چەندساڵێکە لەنوسینا ئەم وتەیەمان بەرچاو ئەکەوێ، بەڵکو لەناو زۆر دەستەی خوێندەوارا، لەسەر کاغەزیشەوە کەوتۆتە سەر زمان.

بۆ نموونە ئەڵێن (بەفلان ئیش هەستا، یا هەڵسا) یا بەئاهەنگێك هەستان یان بەسەیرانێك هەستان...هتد) کار لەمەشدا نەوەستاوە، هەر لەلای ئێمەوە ئەم هەڵەیە چۆتە ناو ئەوانەشەوە کەبەکرمانجیی ژووروو ئەنووسن، لای ئەوانیش ئێستا (پێ‌رابوون)وو (بفی شووڵی رابوو)و (بشاهیا رابوو) ئەبینینو ئەبیستین.

نەلەقسەی ئێستای خەڵکداو نەلەهەموو ئەدەبەکەی کۆنماندا، بەهەموو سامانی فۆلکلۆریشەوە، ئەم جۆرە دارشتنە نابینن، کە بەهۆی فرمانێکی یاریدەدەرەوە مەبەست دەربڕین، چونکە گەر فرمانەکە خۆی لەبەر دەستا بێت چ پێویست بەیاریدەدەر دەکات.

بەڵێ لەکرمانجی ژووروودا فرمانی یاریدەدەرمان هەیە، کە (هاتو تێت)ە، وەك:

هاتە کوشتن، تێتە کوشتن

هاتە خواردن، تێتە خواردن

ئەمەش لەکرمانجیی خواروودا نەهێڵراوە، بەڵکو هەر فرمانەکە خۆی وا ئەگۆڕێ کەمەبەست بدا بەدەستەوە وەك ئەوەی ئەڵێن:

کوژرا، ئەکوژرێ، خورا، ئەخورێ

بەڵام ئەم فرمانە یاریدەدەرەی کرمانجیی ژووروومش بەهیچ جۆرێك بۆ ئەو (پێهەڵسان و پێڕابوون)ە دەست نادات، چونکە کورد لەم مەبەستەدا یەکسەر فرمان بەکارئەهێنێ، گەر فرمانێکی سەربەخۆش بۆ مەبەستەکە نەبێت، ئەوا فرمانی (کرد) ئەخرێتە پاش وشەیەکەوە کە ئەو مەبەستە بگەیەنێت، بۆ ئەوەی شێوەی فرمان بەجێهێنان بدرێ بەڕستەکە، بۆ نموونە لەم بارەیەوە ئەڵێن:

فلان ئیشی کرد، سەیرانێکمان کرد، ئاهەنگێکمان گێڕا

لەکرمانجیی ژووروشدا داڕشتنی (رستە) هەر بەو جۆرەیەو ئەم (پێڕابوون)ە لەگەڵ زمانەکەدا ناگونجێ، لەوێش ئەڵێن:

مەڤی شووڵی کر

ئەز شووڵی تە چێ کەم

شاهی کرن، یاداوەت کرن

گەر ئەم (پێهەڵسان)ەی ئێستا، کە لە (قام بـ)ی عەرەبییەوە هاتۆتە سەر کاغەزو زمانی هەندێ کورد راست بێ، ئەوا ئەگونجێ بڵێین:

بەچاخواردنەوە هەستام، بەنان خواردن هەستام، بەشت کڕین هەستام..هتد بەڵام ئەوەی هەیەو بیستوومانە ئەوەیە کەکورد ئەڵێن:

چام خواردەوە، نانم خوارد، شتم کڕی

کەواتــە بــاواز لــەم (پیّهەســتان)ە بێــنین، بەکوردیەکــەی خــەڵك بنووســین، پیّهەڵسانمان ناوێ، بەڵکو با (ئیش بکەین) ئیش..

★ ★ ★

(٣) ئاهەنگ:

هەر لەم فرمانە نارەواییەوە دێینە سەر وشـەی ئاهـەنگ، کـەزۆرجار لەدەنگ‌وباسی ئێسـتگەدا ئەخرێتــە جێگــەی (حفلــەو احتفــال)ی عــەرەبی، یــا لــەوە بگــەڕێین کــە (بەئاهەنگیّ هەستان) هەر کوردی نىیەو جاروباریش بـۆ ئـەوەی ناکوردی‌یەکە خەست بکرێتەوە، ئەوا لەپیّ هەستانە چەوتەکەوە ئەچنە سەر شتی چەوتتر.

وەك ئەوەی بڵێ (بەئاهەنگێکی نانخواردنی نیـوەڕۆ هەسـتا) ئەمـە دیـارە وەرگێڕانـی (اقام حفلە غذاء)ی عەرەبی‌یە، یا لەوە خەستتر ئەومیە کەئەوتریّ بەئاهـەنگێکی ماتـەم هەستام (یا، قەیناکە) ئاهەنگێکی ماتەمیان گێڕا.

(حفل)ی عەرەبی بەمانا (کۆمەڵ)ە، وەك ئەوە وایە ئەڵێ:

(لدیـە حفـل مـن النـاس) واتـە (کۆمـەڵێ خـەڵکی لەلایـە) کەئەمـە بـەهیچ جۆرێـك لەگەڵ ئاهەنگی کوردیا ڕێك ناکەوێ، چونکە لەعەرەبی‌دا کە (حفل‌و حفلةو احتفـال)، کــە لەکۆمــەڵ‌و کۆبوونــەوە وەرگــیراوە ئــەگونجیّ بــۆ هــەموو جــۆرە کۆبوونەوەیــەك بەکاربێت، ئیتر ئاهەنگ بیّ یا ماتەم.

بەڵام لەکوردیا ئەمە ناگونجیّ بەکارهێنانی شێواندنێکیتری زمانەکەمانە.

چونکە ئاهەنگی کوردی کەهاوجووتی (شایی)یە، بـۆ مانـای کـۆڕی خـۆش‌و گـۆرانی‌و سـەما بەسـتن بـەکاردێت، (شـایی) زۆرتـر بـەڕۆژە، گـەر بەشـەویش بـیّ، ئـەوا بریتـی‌یـە لەهەڵپـەڕکێی حەوشـە یـا دەشـت، بـەڵام ئاهـەنگ، بـەو کـۆڕە ئـەووتریّ کـە لـەژووردا ئەبەستریّ، ئیتر هەر بەردەوامێی شایی‌یەکەی ڕۆژێ یا هـەر بـۆ ڕابـواردنی نـاو بـەناوی کۆمەڵە دۆستێك بێت، یا بۆ (ئێشك)ی منداڵ بێت، بۆ ماتەمیش،

ماتەم‌و تازیّ‌و تازیمنانە کە لەتەعزیەوە هاتووەو پرسە، هەریەکە لەشوێنی خۆیـدا بەکاردیّ‌و ئەتوانریّ ئەم کۆڕی ماتەم‌و ئەو ئاهەنگی ماتەمەشی لیّ وەربگیریّ).

بۆ (نانی نیوەڕۆ)و ئێوارەش، (ئاهەنگ) لەگەڵدا بەکارهێنانی هەر ناگونجێ، بەڵکو بۆ ئاهەنگەکە وشەی بانگ کردنو بانگێشتنمان هەیەو بۆ ژەمەکانی خواردنیش، ئیستیلاحی زۆرمان هەیە، وەك (بەرچایی، فراوین، تاشتێ، قاوەڵتی، نیوەڕۆژ، شیف، شێو..هتد) ئەمانە هەر چۆنێك پەیدابووبن ئەوا ئێستا کوردینو لەناو کوردیدا هەنو هەریەکە لەشوێنی خۆیدا بەکاردێتو جێی ئەکرێتەوە، گەر بۆ وشەی کوردی بگەڕێینو جاروبار تۆزێك لەسنووری سلێمانی دوورتر بڕۆین، ئەوا پێویستمان بەوشەی ناقۆڵای تازەو شتی نالەبار داتاشین نابێتو بەکوردیەکی جوانی ساکاریش ئەنووسین.

(۱) فرمانی یاریدەدەر

لەمەوپێش باسی فرمانێکی یاریدەدەرمان کرد کە (پێهەستان) بوو، لامان وابوو کەئەم فرمانە بەناڕەواو لەڕێگەی زمانی عەرەبیەوە هاتۆتە زمانی کوردیەوەو لەگەڵ گراماتیکی زمانی کوردیدا ناگونجێ.

میللەتان تادێت بەرەو ئەوە ئەڕۆن کەخوێندنی زمانەکەیانو زمانەکە خۆی لەئاڵۆزی رزگاربکەن، لەبەرئەوە کام رێگە لەداڕشتنی ساکارو سفتی زمانەوە نزیکتربێت پەنا ئەبەنە بەر ئەوە.. بەڵام هەندێ لەنووسەرانی ئێمە رەنگە هێشتا بەخۆیان نەزانیبێ، کەزمانێکیتر وای کارکردۆتە سەر نووسینیان کەبەرەو ئاڵۆزیی بەرێت.

ئەم ئاڵۆزییەش هەروەك لەگەڵ گراماتیکی زمانەکەمانا ناگونجێ هەروەها ئەو نووسەرانە لەخەڵکیش دوور ئەخاتەوە، چونکە ئەو خەڵکەی هەزاران ساڵە فێری ئەو زمانە بوون و پاراستوویانە لەو شێوە ئاڵۆزەی داڕشتنی نووسین ناگەن کە لەگراماتیکی کوردییەوە دووربێت.

یەکێك لەم هەڵەو ئاڵۆزکردنەوەیەی زمان ئەوەیە کەهەندێ نووسەر فرمانی یاریدەدەر لەشوێنی خۆیدا بەکارناهێننو شوێن رێچکەی زمانیترو زۆرتر زمانی عەرەبی ئەگرن.

بەپێی تێگەیشتنی من لەزمانی کوردی، فرمانی یاریدەدەر کەزۆرتر (کرد)ە کەسەرچاوەکەی (کردن) یا (کرن)ە لەگەڵ جۆرە (مصدر)ێکدا یا ناوێکدا بەکاردێت کە (فرمان)ی لێ دروست ئەبێت، وەك ئەوەی ئەڵێ:

ئەمڕۆ نان ئەکەین، دوێنێ نانمان کرد

بەڵام ئەگەر ناو یا (مصدر) فرمانی لێ دروست بکرێت، ئەوا ئەو ئاڵۆزییەی ناوێو ئەتوانین هەر بەفرمانێك مەبەست بدەین بەدەستەوەو پێویستی بەدوو فرمان یا (مصدر)ێكو فرمانێکی (کرد) پێکەوە ناکات.

لەم بارەیەوە بانموونەیەك بهێنینەوە، هەڵەیەکی بڵاوەبووش ڕاست بکەینەوە.

★ ★ ★

(٢) دانیشتن:

دانیشتن وەك ئەزانین سەرچاوەی فرمانی (دانیشت، دائەنیشێ، دانیشە)یە.

لەکرمانجی ژووروودا پێشگرەکە ئەگۆڕێو ئەبێ بە (روونیشتن).

شاعیر ئەڵێ منو یارم لەکونجێ دابنیشین

بەمن چی عالەمێ ژێرەو زەبەربێ

یەکێکیتر ئەڵێ:

بێ دابنیشین لەبن دیواران

زنجیر لەگەردن چون گوناهکاران

کەواتە (دانیشتن) هەموو جۆرە فرمانێکی لێوە دروست ئەکرێ، بەڵام سەیر ئەوەیە لەناو گەنجەکانمانا ڕستەیەك باوە کە ئەڵێ:

بادانیشتنێك بکەین

یا: دانیشتنێکمان کرد

ئەمە لەجیاتی: بادانیشین، یا :دانیشتین

ئیتر دانیشتنەکە بۆ رابواردن بێت، یا بۆ گفتوگۆو راوێژبێت، یا دانیشتنێکی رەسمی بێت، ئەوا هەر بەو جۆرەی دوایی ئەوتریٚو پێویست بەوە نییە کە بەو (کردن)ە ڕستەکە بئاڵۆزێنین.

ئەم (دانیشتن کردن)ە تەنیا بەسەر زاری گەنجانەوە نییە بەڵکو واخەریکە لەنووسینیشا بەکاردێتو هەندیٚ ئەدیبی ناسراویشمان جاروبار بەکاریدێنن، وەك ئەوەی ئەڵیٚ:

ئەم هۆنراوەیە ئەنجامی دانیشتنێکە کەشاعیر لەگەڵ فلان کەسدا کردوویەتی.

وابزانم راستتر ئەوەیە کەئەمە بەم جۆرە بنووسریٚ:

ئەم هۆنراوەیە ئەنجامی دانیشتنێکی شاعیرە لەگەڵ فلان کەسدا،

یا: ئەنجامی دانیشتنێکی شاعیرو فلان کەسە.

★ ★ ★

(٣) کۆبوونەوە

هەر لەسەر پێڕەوی ناڕاستی (دانیشتن کردن) شتێکیتریش بلاوبۆتەوە، ئەویش ئەوەیە کەئەڵیٚ:

کۆبوونەوەیەکمان کرد، کۆبوونەوەیەك بکەین، کۆبوونەوەیەك بکە.

هەر لەباسی دانیشتنەکەوە ئەوەمان بۆ دەرئەکەویٚ کەئەم جۆرە ڕستە (جملە) دارشتنەش ڕاست نییەو بیٚ پەنا بردنە بەر فرمانی یاریدەدەری (کرد)یش، ئەتوانین هەر لە (کۆبوونەوە) خۆی کەبریتییە لەوشەی (کۆ)و سەرچاوەی (بوون)و (بوونەوە) فرمانێکی تەواو داڕێژین بڵێین:

کۆبووینەوە، کۆببینەوە، کۆببنەوە، بۆ ئەمەشیان، کۆبوونەوەکە چ جۆرە کۆبوونەوەیەك بێت ئەوا هەر ئەمە ڕاستەو لەقسەی ساکاری خەڵك ئەچیٚو ئاڵۆزی تیا نییە.

★ ★ ★

## ئاڕاستەکردن

نـاتوانین بلـێین (ئاڕاسـتەکردن) وشـەیەکی کـوردی نـیـە، چـونکە لـەناو خەڵکـدا بەجۆرێکی جیا لـەوەی لەنووسینی ئەمرۆماندایـە بـەکاردێتو لەفارسیشدا کـەزمانێکی نزیــك لەکوردیـــەوەو یەکێکــە لەزمانـــەکانی گروپـــی ئێرانیـــی زمـــانی هینـــدۆ ئەوروپاییەکان، واتە (ئاڕاسـتەکردن) هەیـە، کەفارسیش جاروبـار ئەکـەین بەبەڵگـە بـۆ ڕاستیی واتایەکی کوردی، مەبەستمان لەوە جیاکردنەوەی ئەو واتایەیە لەو دارشتنانەوە کە لەعەرەبییەوە وەرگیراونو عەرەبیش وەك ئەزانین زمانێکی سامیـیەو لەکوردیـیـەوە دوورە.

کەواتە فارسی کاتێك ئەبێ بەبەڵگە کە لەعەرەبیو کارکردنە سەر کوردیی بـدوێین، بەڵام هەر لەمەیدانی هەڵەڕاستکردنەوەدا ئەبێ باس لەهەندێ دارشـتنی فارسـی بکـەین کەبـەناڕەوا هاتوونەتـە کوردیـیـەوەو لەگـەڵ گرامـاتیکی زمانەکـەی ئێمـەدا نـاگونجێن، ئێستا بابێینەوە سەر (ئاڕاستەکردن).

ئەم واتایە بۆ ئەوە بەکاردێت کەشتێك لەکەسێکەوە بگیرێتـە کەسـێکیترو مەبەسـت تـەواو لەنیشاندان بێت، یا بەوردی ئەو کەسە یا ئەو شتە بگرێتەوە.

وەك بڵێین: تیرێکی ئاڕاستەکرد.

یا ئەڵێت: هەر تەواو ئاڕاستەی منی کرد

واتە مەبەست ئەوەیە کەگرتوویەتە تۆو نەیگرتۆتە کەسی تر

وائەزانم (ئاڕاستەکردن) هەر بۆ ئەم مەبەسـتە بـەکاردێت، ئـەگینا بـەکارهێنانی بـۆ مەبەستی تر کە لەزماندا فرمانی تایبەتی خۆی هەیە رەنگە بەجێ نەبێ.

بەتایبەتی گەر ئەو جۆرە بەکارهێنانانە زمانەکەو ڕستەکەمان بئاڵۆزێنێو لەجیاتی ئـــەوەی بەتاقــە فرمانێــك مەبەســت بــدەین بەدەســتەوە، دوو یــا ســێ فرمــانی بــۆ بەکاربهێنین.

ئەوەی کەبەلای منەوە لەم بارەیەوە ڕاست نـیـە، ئەوەیە کەئەڵێ:

پرسیارێکی ئاڕاستە کردم

ئەمە بەلای منەوە تەواو وەرگێڕانی ئەو واتا عەرەبییەیە کەئەڵێ:

وجه الي سؤالاً

چونکە بەکوردی ڕێك‌و ڕەوا ئەڵێین:

پرسیارێکی کرد، یا: پرسیارێکی لێ کردم

ئیتر گەر مەبەس لە (ئاڕاستە) وەك تیر تێگرتنەکە بەوردی (تێگرتن) نەبێت، ئیتر پێویست بەم ئاڵۆزییە ناکات.

**بۆ کێ دەنووسین:**

بۆ کێ دەنووسن‌و مەبەس لەم نووسین‌و یا ئەو، یا ئەم وتارەمان‌و ئەویتر چییە؟ ئەمە پرسیارێکەو لەهەر شوێنەدا وەڵامێکی هەیە، ڕەنگە نووسەرێك بتوانێ، وەك جاران وتویانە لەچەند مەیدانێکدا ئەسپی خۆی تاوداو ئەمە نەگونجێ‌و مێژووی نووسینی گەلان زۆر نموونەی وای لایە.

بەڵام گرنگ ئەوەیە کەشتێك ئەنووسی‌و لەجێگەیەکدا بلاوی‌دەکەیتەوە، نووسینەکە ئەو ڕادەیەی نووسەر نەهێنێتە خوارەوە کە لەمێشکی خەڵکدا چەسپیوەو ڕادەی ناوەڕۆکی نووسینەکە نزم نەبێت، هونەریش لەوەدایە کەنووسەرێك بتوانێ ناوەڕۆکی قووڵ بگەیەنێتە خەڵك، بەجۆرێك کە لەگەڵ ڕادەی تێگەیشتنی ئەو خەڵکەدا بێ کەئەم وتارە یا ئەو گۆڤارەیان دەگاتێ، واتە ئەو گۆڤارەی تیا دەنووسێ لەناو چ دەستە خوێندەوارێکدا بلاوە، دەبێ بۆ ئەوانە بنووسی‌و ناوەڕۆکەکەت لەوان بگەیەنێت، لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستی‌یەدا دەنووسین: مەبەسی ئەم زنجیرەیە ڕاستکردنەوەی گەلێ (هەڵەی باو)ە کەبەداخەوە هەر تازە نووسەرەکان تێی ناکەون، بەڵکو زمانی عەرەبی کارێکی وای کردووە کەزۆربەمان لەنووسیندا بکەوینە هەڵەوە، جا نووسینەکە بۆ هەمووانەو گەر ئەوە نەبێ کەهێشتا زۆربەمان کەم چیکەڵانەین‌و هەندێ پێڕەوی نووسین‌و ڕەخنەمان بەشێوەیەکی عیلمی نایەتە پێش چاو، ئەگینا باشتر ئەوەبوو نموونەی (هەڵەی باو)و بلاو لەووتارانە وەربگرین کە لەهەموو ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردی‌یەکاندا دەیبینین‌و هەندێکیان بەخامەی کەسانی ئەوتۆ دەنووسرێن کەناویان تائێستا هەر (باوە) یا بڵێین ئەدرەوشێتەوە.

ئەمە بابەتەکە، چەشنی نووسینەکەی‌و خستنە بەرچاویشی ئەوەی دەویٚ کەبڵێین نووسەرێکمان لای وایە وتاری زمانەوانی دەبیٚ بەجۆرێك دابڕێژریٚ کەزمانەوانانی گەلان وتاری عیملی پیٚ دەنووسن، ئەم تێبینییە تەواو راستە، بەڵام وەك دەرخرا ئەم نووسینە بۆ هەموو نووسەرانمان‌و بۆ هەموو ئەو کەسانەیە کەوا دەستیان داوەتە نووسین‌و مەرەکەبی عەرەبی نووسین، بەدەم نووسینەوە ئەڕژێننە سەر کاغەزی نووسینیشیان.

کەواتە بەو چەشنە برای نووسەر دەیەویٚ، ئەم نووسینە لەسنووری زمانەوانانـدا دەمێنێتەوە، ئێمەش مەبەسمان ئەمە نییەو رەنگە هەقمان بێت، کەهەر ئەو ناوەڕۆکە بەزمانێکی ساکارو سادە بخەینە پێش چاو.

★ ★ ★

## لەهەڵەی باو -کورد -یا -کوردی؟

زۆر ناو بەهەڵە دەخوێنینەوە، زۆر کەس لەقەبی خۆی بەڕێکی نانووسیٚ، زۆر هەواڵی رۆژانە بەجۆرێك ئەخوێنینەوە کە لەگەڵ کوردی نووسیندا ناگونجیٚ، بۆ نموونە زۆر رۆژ گوێت لەدەنگوباسی رادیۆدا دەبێت کەدەڵێن: فیداکارە عەرەبی‌یەکان، گەر تین بدەنە خۆیان‌و بەکوردی‌تر بڵێن، دەبێژن: پێشمەرگە عەرەبییەکان، ئیتر هەر لەم بابەتە- دەوڵەتە عەرەبییەکان‌و سەرۆکە عەرەبییەکان دەبیستین.

ئەو چەشنە قسەیەش زۆر دەبیستین: ژنەکەی ڕووسی‌یە یا ئەڵەمانی‌یە، یا زۆر کەس نە ناوو لەقەبی خۆی بەعەرەبی دەنووسیٚ، بەڵکو بەکوردیش دەینووسیٚ، هەر: هەمەوەندی یا مەنگوڕی.. هتد دەنووسیٚ.

دیارە کە ئەم چەشنە لەکوردی‌دا راست نی‌یە، چونکە کوردێك نابێژیٚ:

من کوردیم، یا ئەز کوردیم، بەڵکو دەڵیٚ: من کوردم، ئەز کوردم، یا ئەز کرمانجم، یا ئەو پیاوە کوردە، ئەو ژنە کوردە، ئەمە ئەگەر کورد سیفەت نەبیٚ بۆ (من، ئەز، ئەو) خۆ ئەگەر ڕستەکە لەپاڵ (سیفەت)دا (نیسبەت)ێکیشی تیابێت، واتە نەك (کورد) بەڵکو شتێك بدرێتە پاڵ (کورد) بکریٚ بەسیفەت ئەوکاتە وشەی کوردی راستە، کەلێرەدا

هەریەك وشە نییە، بەڵكو ووشەی (كورد)و (ی) نیسبەت دانە پاڵیشە، وەك (جلی كوردی).

بۆ نموونە جلی كوردیم لەبەركرد، یا ئەمە بەرگی كوردییە.

چونكە لەوێدا، پیاوەكە خۆی (كورد) بوو، لێرەدا جلەكان كوردنین-بەڵكو بەرگی (كوردن)، بەم پێیە دەڵێن:

ژنەكەی ڕووسە ئەڵەمانە، یا توركە.

بەلام دەڵێن: خواردنی فارسی یا ئەڵەمانییان كردبوو، یا چێشتی ئۆزبەكی یان لێنابوو، هەر بەم پێیە دەبێ بڵێین: فیدائی، یا فیداكار، یا پێشمەرگە (ئەمەیان گرنگ نییە) عەرەبەكان (ئەمەیان گرنگە) واتە: پێشمەرگە عەرەبەكان، نەك عەرەبییەكان، یا دەوڵەتانی عەرەبو سەرۆكەكانی عەرەب، وەك لەكۆندا وتراوە: تیرەكانی جاف نەك تیرە جافییەكان، یا پێغەمبەرانی جولەكە نەك پێغەمبەرە جولەكەییەكان.

هەر لەسەر ئەم پێڕەوە دەبێژین: شاسوار هەمەوەندە، نەوزاد جافە، وەیسی مەنگووڕە، لەناو نووسینیشدا دەبێ بڵێین:

شاسواری هەمەوەند، نەوزادی جاف، وەیسی مەنگووڕ، وەك لەمەوبەر دەیان ووت:

فەقێ قادری هەمەوەند، مەحمود پاشای جاف، ئاغای مەنگووڕ.

بەكورتی لەقەب لەكوردیدا گەر لەناوی تیرەو عەشیرەتەوە هاتبێ ئەوا ناوی تیرەو عەشیرەتەكە دەنووسرێو (ی)یەكی نیسبەت لەنێوان ناوی كەسەكەو ناوی تیرەكەیدا دادەنرێ، وەك لەنموونەكانی سەرەوەدا پیشانماندا.

بەلام گەر لەقەب لەناوی گوند یا ناوچەوە هاتبوو ئەوا (ی)ی سیفەت ناوی شوێن یا گوندەكەو (ی) نیسبەتەكەش هەر دەمێنێتەوە، وەك: مەلای جزیری، مەولەویی تاوەگۆزی، حاجی قادری كۆیی، حوزنی موكریانی.

بەلام گەر لەقەبەكە لەناوێكەوە هاتبێ كەناوبێ بۆ عەشیرەتیشو بۆ ناوچەش ئەوا هەردوو جۆرەكە دەگونجێ، وەك:

بابەكر ئاغای پشدەر، یا پشدەری، ئەمە لەبارەی لەقەبەوە، لەبارەی (ناویش) ئەوا كورد لەجیاتی ئەوەی بڵێ:

شازادەی كوڕی نەریمان، واتە چ لەنێوان ناوو لەقەبدا چ لەنێوان ناوی كوڕو باوكدا تیپی (ی) دائەنرێ.(١)

برا كوردەكانی سۆڤیەت تائێستا ناوی خۆیان هەر لەسەر ئەم پێڕەوە دەنووسن، نووسەرەكانیان ناوی خۆیان بەم چەشنە دەنووسن:

عەربی شەمۆ، قەناتی كوردۆ، جاسمی جەلیل، قاچاخی مراد، میرۆی ئەسەد، میكایلی رەشید، شكۆی حەسەن.. هتد(٢)

بەڵام ئێمە لەسەر پێڕەوی عەرەبی ئەو (ی)یەمان لەنووسینی ناوەكانماندا لەناو داوە، وا ئەزانم ئەتوانین لەقەبەكان نەشێوێنین.

★ ★ ★

كتب احمد درسه امس في الدار في الساعة التاسعة صباحاً

گەر ئەم ڕستەیە بەو چەشنە بكەین بەكوردی كەئێستا هەندێ كەس یا بابڵێین كوا كێ وای نووسیوەو كەی وا وتراوە؟

من ناڵێم ئەم ڕستەیە لەبەر دەستا وانووسراوە، چونكە ئەم ڕستەیە زۆر زەق لەبەرچاوە، بەڵام هەندێ نووسینم لەبەردەمدایە كەڕستەكانی لەمە باشترنین‌و گۆڤارو ڕۆژنامەشیان لێ پڕكراوە، خۆ ئەگەر تەماشای كتێبی قوتابخانە بكەین خراپترو (ساڵ بەساڵ خۆزگەم بەپار) خۆ ئەگەر بتەوێ‌گوێی خۆت بڕوشێنی‌و گوێ لەدەنگوباسی بەیانیانی رادیۆی بەغدا بگریت ئەوا هەر هەمووی ئەم چەشنە كوردییەیە، كەگراماتیكی كوردی تیا تێك دراوەو بەناوی ئەوەشەوە كەبەكوردی پەتییە زۆر وشەی تازەو ناقۆڵا داتاشراوە، كەئەمیش شێواندنێكی تری زمانەكەمانە.

گوایە پێویستە كەڕستە بەڕێكی بنووسین؟ وادەزانم كەهەموو لەگەڵمان بەم چەشنە بنووسین، ئەحمەد دوێنێ سەعات نۆی بەیانی لەماڵەوە دەرسەكەی نووسی، قسەمان لەدوێنێ‌و ئەحمەد نییە كەئەتوانین پاش‌و پێشی بخەین.

مەبەس ئەوەیە کەبۆ ئەوەی کوردیەکە ڕاست بنووسین، دەبێ فرمان هەمیشە لەدواوەبێت، واتە دوا وشەی ڕستەکە بێت.

لێرەدا پرسیارێك هەیە؟ ئایا فرمان لەکوردیدا دەبێ هەمیشە لەدواوەبێت؟

وەڵام: تەنیا لەفرمانێکدا کە لەهەندێ زماندا (فرمانی جووڵانەوە)ی پێدەڵێن، فرمانەکە لەپێشەوەیە وەك ئەمەی دەڵێن: چووم بۆ بازاڕ، هاتمەوە ئێرە، ڕۆیشتم بۆ شار، دیارە لێرەدا فرمان پێشدەکەوێ‌و ئەوسا ڕێگە مەبەسی فرمانەکە دەردەکەوێ: چووم بۆ بازاڕ، چوومە دهۆك.

ڕەنگە لەهەندێ ڕستەدا بەمەبەستێك فرمانەکە پێش بخرێ، بەڵام ئەوەیان دەچێتە خانەی (بەلاغەت ناسیەوە)و لەخانەی گراماتیك وڕاستی‌و هەڵەی دەردەچێ‌و ڕەنگە ئەوە هەر لەشیعردا بگونجێ، بۆ جارێکی ترو هەندێ هەڵەی باو.

# کتێبەکانی نووسەر

١. فەرهەنگۆگ بۆ قوتابیانی کورد- عەرەبی- کوردی- بەغدا- ١٩٥٥.

٢. میرزا فتحعلی اخندوف مترجمة من الروسیة الی العربیة، باکو. ١٩٦٢.

٣. ڕیالزم لە ئەدەبیاتی کوردیدا. (نامەی دکتۆرا بە ڕووسی) کورتە چاپ، باکۆ ١٩٦٣.

٤. الواقعیة في الادب الکوردي- بالعربیة، بیروت، ١٩٦٦.

٥. ڕازی دووری (کۆمەڵێك شیعر و چیرۆك و یادگاری ئەدەبی)، بەغدا، ١٩٦٧.

٦. گولستانی سەعدی شیرازی. وەرگێڕانی مەلا مستەفا سەفوەتی حاجی مەلا ڕەسوڵ- بڵاوکردنەوەو ئیندێکس و بەراوردکردنی لەگەڵ وەرگێڕانی بە چەند زمانی تر لەلایەن (عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ)ەوە.

٧. ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی (لێکۆڵینەوە) بەغدا ١٩٧٠.

٨. زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی (لەگەڵ دوو نووسەری تردا) بەغدا ١٩٧٠.

٩. شانۆی ناوماڵ (نووسینی مەلا مستەفا حاجی مەلا ڕەسوڵ) پێشەکی و بڵاکردنەوەی عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ — بەغدا- ١٩٧١.

١٠. سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتوو بەغدا-١٩٧١.

١١. پەردومردەی ئاینی بۆ پۆلی چوارەمی ناوەندی (وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە و بڵاکردنەوەی لە لایەن ((عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ و عەلادین سوجادی))ەوە- بەغدا-١٩٦٧.

١٢. قافلة من شهداء کردستان ایران- وەرگێڕانی (عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) لە کوردیەوە بۆ عەرەبی بەناوێکی خواستراوەوە (نزار محمود) بەغدا-١٩٧٢.

١٣. حول الصحافة الکردیة —بالعربیة- بغداد ١٩٧٣.

١٤- ١٩ . زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی تا پۆلی شەشەمی ئامادەیی- شەش بەرگ بەشی ئەدەب. لەهەر شەش بەرگەکەدا لەلایەن نووسەرەوە بە تەنیا نووسراوە. (بیجگە لە بەشداری لە نووسینی بەشەکانی تردا) بەغد ا- ١٩٧٣- ١٩٧٦.

٢٠. ئەحمەدی خانی شاعیر و بیرکەرەوە- نامەی دکتۆرا ناوك و ئەفتوریفیرات بە ڕووسی، مۆسکۆ- ١٩٧٧.

٢١. احمدي خاني، شاعرا و متصوفا، فيلسوفا و مفكرا-باللغة العربية- بغداد-١٩٧٩.

٢٢. شێخ ڕەزای تاڵەبانی ، ژیان و بەرهەمی —بە کوردی- بەغدا-١٩٧٩.

٢٣. ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، پوختەکراو لێزیادکراو. بلاّوکراوەی زانکۆی سلێمانی-کوردی- سلێمانی — ١٩٧٩.

٢٤. شیعری کوردی. ژیان و بەرهەمی شاعیرانیکورد- بەغدا-١٩٨٠.

٢٥. جەژنانە(کۆمەڵێك چیرۆك بۆ منداڵان، وەرگێڕاوە لە ڕووسیەوە بۆ کوردی. لە لایەن عیزەدین مستەفا ڕەسوڵەوە)بەغدا، ١٩٨٢.

٢٦. عەمەرێ جەلالی (داستانێکی شیعریە، ئامادەکردنی جاسمی جەلیل) (عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ لە تیپی سلافیەوە خستویەتیە سەر تیپی عەرەبیی کوردی نووسین. لەگەڵ نووسینی پێشەکی و فەرهەنگ و ئیندیکس بۆ کردنی)بەغدا، ١٩٨٣.

٢٧. بطولة الكرد في ملحمة قلعة دمدم- ترجمة شكور مصطفى عن (عەمەری جەلالی للشاعر جاسمي جليل)- تقديم و مراجعة الدكتور عزالدين مصطفى رسول. بغداد، ١٩٨٣ (طبع مرة اخرى ببيروت من قبل دار كاوه).

٢٨. دیوانی سەفوەت(دیوانی شیعری مستەفا سەفوەتی حاجی مەلا ڕەسوڵ)ە. کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەو پێشەکی بۆ نووسینی عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) کوردی، بەغدا، ١٩٨٣.

٢٩. مەمی ئالان (وەرگێڕانی لە کوردیەوە بۆ عەرەبی و پێشەکی بۆ نووسینی عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ)عەرەبی، بەغدا ١٩٨٤.

٣٠. دیوانی ئەحمەد موختار جاف(ئامادەکردن و لێکۆڵینەوە و نووسینی عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) بەغدا، ١٩٨٧.

٣١. دراسة في ادب الفولكلور الكردي(للمولف نفسة باللغة الكردية. قام بترجمتة بنفسة مع اضافات- الى العربية)بغداد ، ١٩٨٧.

٣٢. عبدالواحد نوری- بەرهەمی تەواوی (کۆکردنەوە و پێشکەش کردنی عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ) بەغدا ١٩٨١.

٣٣. نظرية الادب الشرقية. مترجمة عن الروسية اعدد من الكتاب السوفيت. ترجمة ع.م.ر) الى العربية. بغداد ١٩٨٩.

٣٤. زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو( یاساو بەرەو پێشچوونی) (وەرگێڕانی کتێبی پرۆفیسۆر ڤینۆگرادۆڤ لە ڕووسیەوە بۆ کوردی) بەغدا،١٩٨٩.

٣٥. ئەدەبی نوێی کوردی. کوردی. هەولێر، ١٩٩٠.

٣٦. مەلای جزیری (شتێك دەربارەی ژیان و بەرهەمی) کوردی. هەولێر ١٩٩٠.

٣٧. عبدالله گۆران. الاعمال الشعرية الكاملة (ترجمة و تقديم) من الكردية للعربية. باللغة العربية. بغداد .١٩٩٠

٣٨. نظرية الادب الشرقية- لمجموعة من كتاب البلدان الاشتراكية. ترجمة د. عزالدين مصطفى رسول. مراجعة الدكتور ضياء نافع، بغداد، ١٩٩١. ٣٩. اربعون عاما من الكفاح. (وەرگێڕانی کتێبی د. عەبدورەحمان قاسملو لە کوردییەوە بۆ عەرەبی و پێشەکی بۆ نووسینی ع.م.ر)هەولێر،١٩٩٢.

٤٠. ئوستاد (ڕۆمان)، کوردی. سلێمانی،١٩٩٨.

٤١. دیوانی موخلیس (حاجی مەلا ڕەسوڵی دیلێژە). کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە و پێشەکی ع.م.ر کوردی سلێمانی ١٩٩٨.

٤٢. کورد(وەرگێڕان و پێشەکی و پەراوێز بۆ نووسینی کتێبی مینتیشاشڤیلی لە رووسییەوە وەرگێڕان) (ع.م.ر)کوردی سلێمانی،١٩٩٨.

٤٣. مسالة كردستان (ترجمة منقحة لكتاب قدري جميل پاشا، زنار سلوپى من التركية الى العربية مع مقدمة مطولة من قبل ع.م.ر بيروت ١٩٩٧.

٤٤. ديوان الشعر الكردي. ترجمة و تقديم ع.م.ر دمشق ١٩٩٨.

٤٥. الدراسات الادبية المقارنة (ترجمة كتاب ژيرمونسكى- من الروسية الى العربية مع هوامش) السليمانية ٢٠٠٠ ج ١ .

٤٦. الدراسات الادبية المقارنة او علم الادب المقارن. ترجمة كتاب ژيرمونسكى- من الروسية الى العربية مع هوامش) السليمانية ٢٠٠٠ ج ٢.

٤٧. مم و زين (ترجمة ملحمة احمدي خاني من الكردية الى العربية، ٢٦٦٥ بيتا) مع مقدمة و هوامش، بالعربية. السليمانية ٢٠٠٠.

٤٨. گڕی دڵ- شعلة القلب- دیوانی شیعر بە پێشەکی و لێکۆڵینەوەوە کوردی.سلیمانی ٢٠٠١.

٤٩. شاتوو (الفرصاد)، کۆمەڵێ چیرۆکی کورت. سلیمانی ٢٠٠١.

٥٠. چیرۆکی نوێی کوردی، شیعری تازەی کوردی.نامیلکە. سلێمانی ٢٠٠٠.

٥١. قەدری جان. کۆکردنەوەی بەرهەمی شیعری و چیرۆك و وتارو و وەرگێڕان. خستنە سەر تیپی نووسینی عەرەبی.پێشەکییەکی ٥٦ لاپەڕەیی. سلیمانی ٢٠٠٢.

٥٢.بۆ زمان- سلێمانی- ٢٠٠٤.

لەژێر ژاپدا

١-کۆماری کوردستان، لە بەڵگەنامەکانی سۆڤییەتدا.

وەرگێڕانی: د. ئەفراسیاد هەورامی. پێشەکی و پەراوێزی نووسەر.

٢-بقلم کردی، کۆمەڵێك وتاری نووسەرە.